# منداڵیی سازگارترین دۆخی مرۆڤبوونە



منـداڵ، پـارچەیەک توانـا و لێهـاتنی نـاوازەیە. ئەگەر زەمینـەی لەبـاری بـۆ بڕەخسێت، دەبێت بە باشترین کەسێتی کە لە توانایدایە ببێت. ئەگەر تەماشایەکی پێکهاتەی کۆئەندامی دەمار بکەین؛ ژمارەی ئەو دەمارەخانانەی کە مێشـک پێـک دەهێـنن بە زیـاتر لە (١٠٠) ملیـار دەمارەخـانە دەخەملێنرێـت. هـاودەم لەگەڵ ئەزموونکردنی ژیاندا، هەر یەکێکیان لەگەڵ (٥ بۆ ١٠) هەزار دەمارەخانەی تـردا پەیوەندی دروست دەکات و دەمارەڕێڕەو (neural pathways) پێـک دەهێنێـت. ئەم سیسـتەمە کۆمەڵێـک بەرنـامەی سەرسـوڕهێنەری لەسـەر دانـراوە، لەوانە؛ "ناڕەحەت بە بەو شتانەی کە ناڕوون و نەزانـراون، ئـۆقرە مەگـرە هەتـا کەشـفیان دەکەیت!" بەرنامەیەکی تر؛ "پەیوەندی دروست بکە لەنێوان ئەو شـتانەی فێریـان دەبیت!"... هتد.

**هەموو ئەمانە چیمان پێ دەڵێن؟ بەدڵنیاییەوە پێمان دەڵێن کە منداڵ بە توانا و ئامادەگییەکی بێسنوورەوە دێتە ئەم دنیایە. هەر ئەوەشـە وا لە مرۆڤ دەکات کە پەی بە نهێنییەکانی گەردوون ببات و پەرلەکـانی ئەو زمانە تەکوینییە بکاتەوە، کە کردگار بـوونەوەرانی پـێ ئافرانـدووە و لە باڵاترین ئاستدا بە فەرمانبەری ئاوەدانکردنەوە هەڵبستێت.**

**بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە؛ ئایا ئێمە بەو چـاوەوە تەماشـای منـداڵەکانمان دەکەین؟ ئایـا متمانەمـان بەوە هەیە کە هەمـوو منـداڵێک گەنجینەیەکـی**

بێهاوتـایه و کلیلەکـانی لە دەسـتی باوانیـدایە؟ بە چیـدا بـزانین ئەو کــۆرپەیەی لە باوەشــماندایە، غانــدییەک یــان مەولانــایەکی چەکەرەنەکـردوو نیـیە؟ یـان ئەو تـۆوە نیـیە کە دواتـر بەر دەگرێـت و تروسکایی ئومێد بۆ هەزاران کەس دەگەڕێنێتەوە؟

هیچ کام لە ئێمە نازانێـت نـاواخنی ئەو جەسـتە بچـووکە چ ڕازێکـی لەخـۆ گرتووە و لە نەخشەی نەخشەکێشی ئەزەلیدا، ئاوێنەی درەوشانەوەی چ جـوانی و کەماڵێکە!

بەڵام، مەخابن ئێمەی دایک و باوکان زۆر جار ئەو منداڵە پەروەردە دەکەین، کە لە زیهنماندایە. قاڵبە کلتوورییەکـان، میـدیا، پێداویسـتییە پڕنەکراوەکـانی سـەردەمی منـداڵیی خۆمـان، هەمـوو ئەوانە وێـنەی منداڵێکی نموونەیی لە هۆش و بیرماندا دەنەخشێنن. منـداڵی نـاو ئەو وێـنە خەیـاڵکردە، هەرگیـز یەکسـان نیـیە بە حەقیقەتـی ئەو منـداڵە خواکردەی بووەتە میوانی ماڵمان. بـۆیە لێـرەوە دەکەویـنە لەقاڵبـدانی منداڵەکەمان، بەگوێرەی وێـنەکەی خەیـاڵمان. متمانەمـان نیـیە کە ئەم تۆوە نەخشەیەکی خواکردی تێدا دەستبەکارە، تەنها پێویستی بەوەیە ئاو و هەوای گونجـاوی بـۆ فەراهەم بهێنرێـت و لە شـتە زیانبەخشـەکان بپارێزرێــت. لەبەر ئەوەیە بڕوامــان وایە کە پێویســتە منــداڵ پەروەردە بکرێت. لە کاتێکدا قۆناغی منداڵی سازگارترین دۆخی مرۆڤبوونە.

بەڵێ، پەروەرشیاری هۆشیار ڕێنیشاندەرە، نەک لەقاڵبدەر. دەزانێت کە پەروەردەکردنی منداڵ واتە پەروەردەبوونی خۆی. مـتمانەی هەیە بە منداڵەکەی و دڵنیایە هیچ منداڵێک بە لادانی ڕەفتاری لەدایک نابێت، تا

پێویست بکات ئەم ڕاستی بکاتەوە. هەر گرفتێکیش لە جگەرگۆشەکەیدا ببینێت، پێش ئەوەی دەست بکات بە ڕاستکردنەوەی، لە خۆی دەپرسێت: "چ شتێکمان کردووە، بووەتە هۆی ئەوەی منداڵەکەمان بەو جۆرە ڕەفتار بکات؟"

هەموو دایک و باوکێک دڵسۆز و لێوانلێوە لە ئەوین و خۆشەویستی. هەموو منداڵێکیش خەڵاتێکی خودایی و ئومێدی ژیانێکی باشترە بۆ مرۆڤایەتی. کەواتە با کارزانانە ئەم دوو تۆخمە ئاوێتە بکەین و پێکەوە چێژ لە ژیان وەربگرین.

**ئەحمەد خالیدی**

**ماستەر لە پەروەردە و ڕاوێژکاریی خێزان**

# له دەستپێکدا



لە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا هەم دایکـایەتی، هەم باوکـایەتی قورسـە، هەم ئەوەش کە منداڵی بەر دەسـتی دایکـان و باوکـانی ئەمـڕۆ بیـت. لە ڕاسـتیدا چـاوەڕوانیی بـاوان لە ڕۆڵەکانیـان ئەوەنـدەش زۆر نیـیە. خەون و خولیـای بـاوان ئەوەیە، جگەرگۆشـەکانیان خـاوەن ڕێـز و پەروەردە و سەرڕاسـت و بەئەمەک دەربچن. ئەی منداڵان؟ دەی خـۆ ئەوانـیش داوای شـتێکی جیـاواز ناکەن. دەیانەوێت پەروەردەیەکی باش وەربگـرن و هەسـت بە خۆشەویسـتی و بەهای خۆیـان بـکەن. دەی کە وا بێـت هەڵەکە لەکوێـدایە، وا لەو هەمـوو مرۆڤە نیازباشەوە منداڵی بێ پەروەردە و دوور لە ڕێز و هەڵەشـە و شـەڕانگێز بەرهەم دێت؟ بە بڕوای ئێوە لەو نێوەندەدا، ئـێمەی دایـک و بـاوک دەکەویـنە چ هەڵەیەکەوە؟ دەبێت دایکان چ پشکێکیان لەمەدا هەبێت؟ تۆ بڵێی دایکـایەتی و باوکایەتی هونەرێکی تـایبەتی خـۆی هەبێـت و ئـێمە لێـی بێئاگـا بـین! ئەم کتێبەی بەر دەستی تۆی ئازیز، لەپاڵ باسکردنی ئاسانیی ئەرکی دایکـایەتی و باوکایەتی، ڕۆشنایی دەخاتە سـەر ئەو وردەکـارییە ورد و گرنگـانەی کە زۆر جار فەرامۆش دەکرێن. هاوکات ڕێگەچارەی گونجـاو بـۆ ئەو گـرفتە بـاوانە پێشنیار دەکات، کە زۆرێکمان بەدەستیەوە گیرۆدەین.

**ئادەم گیونەش**




# بۆچی دایکان
# ناتوانن دایکایەتی
# بکەن؟



# بۆچی دایکان ناتوانن دایکایەتی بکەن؟



با هیچ ئافرەتێک گومانی لە خۆی نەبێت و نەڵێت: "تۆ بڵێی من دایکێکی باش بم؟" چونکە هەموو دایکێک بەسۆزە، پارێزەرە، لێوانلێوە لە ئەوین و خۆشەویستی و بێ دوودڵی خۆی دەکاتە قوربانی ڕۆڵەکەی. مەگەر نابینن مریشک چی دەکات بۆ جوجەڵەکانی؟ ئامادەیە لەپێناو سەلامەتیی جووجەڵەکانیدا، بچێت بەگژی شێردا.

## ئایا لە پەروەردەی منداڵدا، نیازی باش و خۆشەویستی بەسە؟

باشە، سەرباری ئەو هەموو گرنگی و سۆزە بێسنوورەی کە دایکان هەیانە بەرامبەر منداڵەکانیان، بۆچی زۆر جار چاومان بە هەناسەی سارد و ڕەنجەڕۆیان دەکەوێت؟ ئایا نیازباشی و خۆشەویستی بەسە؟ بۆچی دایکانی پڕ سۆز و بەزەیی، منداڵی بێ هەست و بێ سۆزیان دەبێت؟ هەڵەکە لەکوێدایە؟

بەداخەوە، لە پەروەردەی منداڵدا نیازی باش و خۆشەویستی بەتەنها بەس نییە بۆ پێگەیاندنی منداڵی چاک و خاوەن هەستی خۆشەویستی. هیچ دایکێک باوەڕ ناکات، کۆرپەکەی پیاوکوژ و تۆقێنەر و جەردەی لێ دەربچێت. کەچی کاتێك چاو بە ڕۆژنامەکاندا دەگێڕین، دەبینین هەموو پیاوکوژ و تۆقێنەر و تاوانبارەکان ئەو کۆرپانەن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە ئامێزی پڕ سۆز و میهری دایکیاندا بوون.

## پەروەردەی منداڵ وەك بەڕێوەبردنی ئۆركێسترا وایە

دایک، وەک بەڕێوەبەری ئۆرکێسترا وایە. هاوشێوەی هەستیاریی ئاوازدانەری ئۆرکێسترا، ئەرکی چاودێری و ئاراستەکردنی دنیای (ڕۆحی و جەستەیی)ی منداڵەکەی لەئەستۆدایە. هەر وەک چۆن بەتەنها نیازی باشی ئاوازدانەرەکە نابێتە هۆی ئەوەی ئۆرکێستراکە ئاوازی جوان بەرهەم بهێنێت، ئاواش نیازی باشی دایک بەس نییە بۆ ئەوەی منداڵەکەی بەباشی پەروەردە ببێت.

لەبەر ئەوە جێی سەرسوڕمان نییە کە زۆر جار دایکان لە ئەنجامی ئەو بارە گرانانەی لەسەر شانیانە، ناتوانن بە ڕۆح بە منداڵەکانیانەوە پەیوەست بن. بیرمان نەچێت گرنگترین لایەنی پەروەردەی منداڵ ئەوەیە، دایکەکە خۆی بناسێت. دایکێک سەرکەوتوو نەبوو بێت لەوەی بەناو ناخی خۆیدا قووڵ بووبێتەوە، ناشتوانێت بچێتە ناو (دنیای هەست)ی منداڵەکەیەوە و لەگەڵیدا یەکانگیر ببێت. لەبەر ئەوە، مەحاڵە ئەو دایکانە بتوانن کەشێکی پەروەردەیی تەندروست بۆ منداڵەکانیان فەراهەم بهێنن.

## توانای دایك لە چ ئاستێكدایە؟

هیچ دایکێک نییە خەون و خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگی نەبێت بۆ منداڵەکەی. کە وا بێت لەبەر چی زۆر جار هەورێکی ڕەش جێگەی ئەو خەونە ڕەنگالآنە دەگرێتەوە و دایکیش و منداڵیش ئاسوودەییان لێ دەشێوێت؟ داخۆ ئەم بارگرانییە لەکوێوە هاتووەتە سەرشانی دایک؟ ئەزموونەکانی ژیانی ڕابردوو تا چ ئاستێک کاریگەرییان هەیە لەسەر ئەوەی دایکەکە نەتوانێت دایکایەتی بکات؟ دەبێت لەبەر چی ئەو دایکە بەرگەی بچووکترین دەنگی منداڵەکانی نەگرێت، لە کاتێکدا جاری وایە لەگەڵیاندا منداڵ دەبێتەوە و دەچێتە ناو دنیاکەیانەوە؟

زۆربەی ئەو دایکانەی بێسەبرن، دەبینین زیاد لە بار و ئەرکی کەسێکی ئاساییان لەسەرە. ئیدی لەناو بارگرانییەکانی ئەمڕۆ و یادەوەرییە تاڵەکانی ڕابردوو، دایکی بەستەزمان وای لێ دێت بەرگەی کەمترین فشار نەگرێت. لەبەر ئەوە، بەرگەی بچووکترین دەنگەدەنگ و ناڕێکی ناگرێت. ئەمەش بۆخۆی ڕوونترین ئاماژەیە، بۆ ئەوەی کە توانای بەرگەگرتنی دایک گەیشتووەتە دوا سنووری. ئەگەر منداڵەکەی بێ مەبەست پەرداخی سەر مێزەکە بخاتە خوارەوە، بەپەلە دێت و زللەیەکی لێ دەدات. کەچی هەمان ئەو دایکە، شەو لەناو ئازاری ئەو ڕەفتارە چەوتەی فرمێسکی پەشیمانی دەڕێژێت. ئەوەندە هەیە، ئەم حاڵەتە ڕۆحییەی سوودێکی ئەوتۆی پێ ناگەیەنێت. بۆ ڕۆژی دواتر ئەگەر منداڵەکەی هەمان شت دووبارە بکاتەوە، ئەویش بە هەمان شێواز مامەڵەی لەگەڵدا دەکاتەوە. چونکە ئەو ئافرەتە پێی بزانێت یان نا، لەژێر باری ئەرک و قورساییەکانی سەرشانیدا پلیشاوەتەوە، لەبەر ئەوە ناتوانێت بەسنگفراوانی لەگەڵ منداڵەکەیدا بجووڵێتەوە.

## قورساییەکانی سەرشانی، ناهێڵن دایکایەتی بکات

وەک لەسەریشەوە ئاماژەمان پێ دا، یەکەم هەنگاوی پەروەردەی منداڵ بریتییە لەوەی دایک بەناو ناخی خۆیدا قووڵ ببێتەوە و هەوڵ بدات خۆی بناسێت. ئەوانەی ئەمە ناکەن، وەک ئەو یاریزانی پێشبڕکێیە وان، کە بە درێژایی ماوەی ڕاکردنەکەی، چەندین باری قورسی لەکۆڵی خۆی ناوە. بەداخەوە، زۆربەیان لە پێشبڕکێکەدا دوا دەکەون و نازانن چی بکەن. هەر چەندە دڵی خۆیشی بداتەوە و باوەڕ بە خۆی بهێنێت کە: "بەڵام خۆ من نییەتم باشە، منداڵی من خراپ دەرناچێت!" ڕۆژ دوای ڕۆژ تووشی بێهیوایی دەبێت و وردە وردە وای لێ دێت بڵێت: "خۆزگە لەبری تۆ، بەردم ببووایە!"

لەبەر ئەوە لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کۆڵ و قورسـاییەکانی سەرشـانی دایـک پیشانی دایکانی ئازیز بدەین و تیشکیش بخەینە سەر شێوازی ڕزگاربوون لێیـان. ئیدی کاتێك دایک بە هاوکاریی هاوسـەرەکەی یـان پسـپۆڕ یـاخود هەر خـۆی، لەژێـر ئەو قورسـاییانە دێـتە دەرەوە، هەسـت دەکـات ڕۆحـی هێنـدەی پەڕی باڵندەیەک سووک بووە، چێژ لە فڕین دەبینێت لە ئاسمانی پەروەردەی منداڵدا.

## ئاشنایەتیی دایك لەگەڵ خودی خۆیدا

لەمڕۆدا، ژیانی مۆدێرن بەبێدەنگی پاڵ بە ئافرەتـانەوە دەنێـت بەرەو تەنهـایی. دایک بیەوێت یان نـا، لە کەسـوکار و دەوروبەرەکەی دادەبڕێـت. تـا ئەوەی وردە وردە لە هاوکـاریی کەسـانی بەئەزمـوونی وەک دایکـی و خەسـووی بێـبەش دەبێت، بە ئەزموون و تێڕوانینی سـنووورداری خـۆیەوە هەوڵ دەدات منـداڵەکەی پەروەردە بکـات. ئەو دایکـانەش کە دایـک و خەسـوویان لەگەڵیـانن یـاخود نزیکیانن، بە هـۆی لێکتێنەگەیشـتنی نێوانیـانەوە، وەک پێویسـت سـوودیان لـێ وەرناگرن. ئیدی ئەو ئـافرەتەی تـازە بـووە بە دایـك، بەتەنهـا لەگەڵ کۆرپەکەیـدا دەمێنێـتەوە. هەر چەنـدە پێداویسـتیە جەستەییەکانیشـی وەک پێویسـت بەجـێ بهێنێـت، بەڵام ڕەنـگە شـارەزاییەکی ئەوتـۆی نەبێـت سـەبارەت بە پێداویسـتییە ڕۆحی و سۆزدارییەکانی. چـونکە پێگەیانـدنی منـداڵ بەبـێ بـوونی کـۆمەکیی دەوروبەر، تا بڵێی کارێکی ماندووکەرە.

ئاشکرایە گۆڕانکارییە هۆرمۆنییەکانی قۆناغی دووگیانی، کۆئەندامی دەماری ئافرەت ماندوو دەکەن. بۆیە ڕەنگە کۆمەڵە کـاردانەوەیەکی وەهـا بنوێنێـت، کە لە جێی خۆیدا نەبن. جاری وایە دەکەوێتە پەلەقاژەی ئەوەی چۆن هاوسـەرەکەی لە خۆی نزیک بکاتەوە، چونکە وا گومان دەبات لێـی دوور کەوتـووەتەوە. جـاری وایشـە بیرکـردنەوە لە ئازارەکـانی سـەروەختی منـداڵبوون هەراسـانی دەکـات و

بەنائومێدی دەکەوێتە بیرکردنەوە لەوەی چۆن هەست بە پێداویستییەکانی کۆرپەیەکی تازەلەدایکبوو بکات و بەدەمیەوە بچێت. دەبێت بزانین کە هەموو ئەمانە، لەڕادەبەدەر ناڕەحەتی بۆ دایک دروست دەکەن. بۆیە هەر ڕەفتارێکی لێ بوەشێتەوە، ئاساییە. کاتێک منداڵ دێتە دنیاوە، لە باوەشی دایکێکدا دەست دەکات بە ژیان کە باری دەروونی سەرەوژوور بووەتەوە. لەبەر ئەوە زۆر گرنگە لەم قۆناغەدا باوک لەپەنا هاوژینەکەیدا بێت و هاوکاریی سۆزداری بکات و بە ڕۆحیەتێکی تێگەیشتووانەوە مامەڵە لەگەڵ چەوتییەکانیدا بکات.

## دایک چۆن دەتوانێت خۆی بناسێت؟

لە پەروەردەی منداڵدا پرسیاری سەرەکی ئەمەیە: دایک چۆن خۆی بناسێت؟

هەر چەندێک بانگەشەی ئەوەش بکەین کە خۆمان دەناسین، بەڵام دەبێت بزانین کە هیچ شتێک هێندەی ئەوە قورس نییە مرۆڤ خۆی بناسێت. بەتایبەت دایکێك کە ماندووبووە بەدەست هەوڵ و تەقەلای بۆ ژیان، ئەم دایکە زەحمەتە بتوانێت کات بۆ خۆی تەرخان بکات. هەربۆیە لە بڕگەکانی دواتردا قسە لەسەر ئەوە دەکەین دایکان چۆن خۆیان بناسن. بۆ ئەو مەبەستەش، ئاماژە بە (٢٨) خاڵی بنەڕەتی دەدەین، کە ڕاستەوخۆ کاریگەرییان هەیە لەسەر پەروەردەی منداڵ.

> **ئەو دایکەی تووشی نائومێدی بووە و چێژ لە ژیانی نابینێت، ئەستەمە بتوانێت منداڵەکەی تەندروستانە پەروەردە بکات.**

# ڕێبەری خودناسیی دایک

## ١- ئایا دایک گڕوتین و چێژی ژیانی ماوە؟

گــرنگترین لایەنــی پەروەردەی منــداڵ، چێــژی ژیــانە. جــاری وا هەیە گرفتەکانی ناو خێـزان ڕوو لە زیـادبوون دەکەن و بەرپرسـی یەکەمـی پەروەردەی منداڵ کە دایکە، گڕوتین و ئارەزووی ژیـانی نامێنێـت. ئیـتر تووشـی بێئومێـدی دەبێت و ڕەشبینانە پرسـیار لە خـۆی دەکـات: "سـبەینێ چ جیـاوازییەکی لەگەڵ ئەمڕۆدا دەبێت؟" وەک دەزانین، بێئومێـدی دڵتەنگـی بەدوای خۆیـدا دەهێنێـت. ئەو دایکەی تووشی نائومێدی بووە و چێژ لە ژیانی نابینێـت، ئەسـتەمە بتوانێـت منداڵەکەی تەندروسـتانە پەروەردە بکـات. منـداڵیش بـۆ کەسـێکی وا، جـگە لە (بارگرانی) هیچی تـر نیـیە و هەمـوو هەڵسـوکەوتێکی شـایانی تووڕەبـوونە. بەم شێوەیە، دایک هەنگاو بە هەنگاو دەخلیسکێتە نـاو گێـژاوی تونـدوتیژییەوە. هەر ئەوەندەی پێی فێر بـوو، ئیـتر مەحـاڵە دوایـی بێـت. ئـاخر تونـدوتیژی هەوێنـی توندوتیژییە. دایکی ماندوو لە لایەکەوە بە هـۆی ئەو بـارە گـرانەی کە لە نەمـانی چێژ و ئارەزووی ژیانەوە کەوتـووەتە سەرشـانی و لە لایەکـی تریشـەوە بە هـۆی خـراپ جـووڵانەوەی لەگەڵ منداڵەکەیـدا کە گیـری خـواردووە بەدەسـتیەوە و پەشیمانە لەوەی توندوتیژی بەرامبەر نوانـدووە، هەڵە لەسـەر هەڵە دەکـات. خـۆ ئەگەر ئەم زنجیرەی توندوتیژییە لە شوێنێکدا نەوەسـتێنرێت، ئەوا دەبێـتە بەشـێک لە ژیان. پاشان بۆ ئەوەی هەست بە ئـازاری ویژدانـی نەکـات، دەکەوێـتە بەهـانە هێنانەوە لە ڕێی کۆمەڵە بیانوویەکی وەک: "حەقی خـۆیەتی لێـی بـدەم!"، "چـی بکەم، چاری ترم نییە!" هەوڵ دەدات دەنگی ویژدانـی کـپ بکـات. واتە چـاوی خۆی دەنوقێنێت لە ئاست هەڵەکانیدا و وا دەزانێت ناچار بووە بەو جـۆرە ڕەفتـار بکات. بە تێپەڕبوونی ساڵانیش، خۆیشی باوەڕ بە خۆی دەکات.

که وا بێت کاتێك دایکێک دەیەوێت سـەرلەنوێ بە خـۆی ئاشـنا ببێـتەوە، دەبێت ئەم پرسیارانە لە خۆی بکات: "ئایا وەک پێویست دڵخۆشم بە ژیـان؟ هیوام بە ئایندە هەیە؟ ئەو شـتانە چـین کە منیـان بەسـتووەتەوە بە ژیـانەوە؟" ئەگەر دایک وا بیر بکـاتەوە کە خـۆش مـامەڵەیی و ئـارامگرتنەکەی لەسـەر پەروەردەی منداڵەکەی بەرهەمی نابێـت، هەروەهـا خەیـاڵی ئەوە نەکـات کە کچەکەی/کوڕەکەی لە ئاینـدەدا کەسـێکی نـاوازەی لـێ دەردەچێـت و وەک پێویست هانی خۆی نەدات بۆ داهـاتوویەکی گەشـتر، مانـای وایە بەشـێکی گرنگی چێژی ژیانی لەدەست داوە.

چەند ساڵێک پێش ئێستا کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵ خانمێکی مامانی، ئەوە بـوو ئەم یادەوەرییەی خۆی بۆ گێڕامەوە:

"لە ژیانی هەموو مرۆڤێکدا کەسانێک هەن کە هەمیشە جێگەیـان دیـارە، (ئە. ئە) و خێزانەکەشی لەو کەسانە بوون بۆ من. ڕاستە مـاوەیەکی کەم ناسـیمن، بەڵام کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو لەسـەرم. لەکـاتی منداڵبوونـدا لەگەڵ دایکەکەدا بووم، کۆرپەکەی کەمئەندام بوو. زۆر بێتـاقەت بـووم بـۆی، بەڵام کە تەماشای دایکەکەم کرد، دەبینم کۆرپەکەی لەئامێز گرتـووە و زەردەخەنەی بە ڕوودا دەبارێنێت، نیگاکانی پڕ بوون لە سۆز و خۆشەویستی. سەرم سووڕما. کە چوومە دەرەوە بە باوکیم وت منداڵەکەیان بەکەمئەنـدامی هـاتووەتە دنیـاوە، ئەویش بێ هیچ دوودڵییەک بزە لە ڕووخساریدا دەرکەوت. کـاتێکیش چـووە ژوورەوە، ئەوەندە دڵخۆش بوو پێیان، لە دڵی خۆمدا دەموت: "بە خودا باشـە کە ئەم منداڵە لەناو ئەم خێزانەدا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە!" ئامـادەی چەنـدین حاڵەتی منداڵبوون بووم، لەو حاڵەتانەدا زۆربەی جـار گریـانی بێچـارەیی و سکاڵای دایکانم بینیوە."

ئاشکرایە خێزانی ناو ئەم نموونەیە چێژ و حەزی ژیانیان لەدەست نەداوە، بگرە بەپێچەوانەوە زیاتر خرۆشا بوون. دەبێت نهێنی ئەوە چی بێت کە سەرباری بوونە خاوەن منداڵێکی کەمتوانا، کەچی هێشتا بەدەم ژیانەوە پێدەکەنن؟ دوای چەندین ساڵ دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسا لەگەڵ ئەو خێزانەدا سەبارەت بە منداڵەکەیان قسە بکەمەوە، ئەودەم هەشت نۆ ساڵان دەبوو. دایکەکە بەم جۆرە باسی لەو خۆشبەختییە دەکرد، کە بە هۆی منداڵەکەیانەوە دەستی کەوتووە:

"زۆر بەختەوەرم، چونکە دایکی منداڵێکم کە چوونە بەهەشتی مسۆگەرە. بە درێژایی ژیانی لە خراپە بەدوور دەبێت و بەبێ گوناهـ دەچێتە بەهەشتەوە. بەڵام هیچ کەس لە ئێمە ئەو گەرەنتییەی نییە. بایەخێکی تایبەتی پێ دەدەم، زۆر دڵخۆشم بەوەی کە خزمەتی میوانێکی بەهەشتی دەکەم."

ئەم دایکە ئەوەندە دڵخۆش بوو بە ژیان، هەم بایەخی بە منداڵەکەی دەدا، هەم بارەکانی سەرشانیشی سووکتر ببوون. لەبەرامبەردا دایکێکی تریشم ناسی، کە منداڵێکی خاوەن پێداویستی تایبەتی هەبوو. بەڵام ئەمیان باری منداڵەکەی پێ هەڵنەگیرابوو و بەس بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگە دووری بخاتەوە لە ژوورێکدا بەندی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، بەردەوام شەرمی لە حاڵی کوڕەکەی دەکرد و خۆی و مێردەکەی بە بەرپرسیار دەزانی. ئەندامانی ئەم خێزانە هەر چییەکیان دەکرد، نەیاندەتوانی خۆیان لە ئازاری ویژدانیان قوتار بکەن. وێرای دەوڵەمەندییان، کەچی بەدەگمەن نەبێت، خەندە نەدەبووە میوانی سەر لێویان، لەژێر باری سەرشانیاندا پلیشابوونەوە. ئومێدێکیان نەمابوو بە داهاتوو و چێژیان لە هیچ شتێک نەدەبینی، دەتوت وەڕس بوون لە ژیان.

کە وا بێت پێویستە دایکان دەستبەرداری ئەوە بن، کە خەفەت بۆ بارودۆخی دژواریان بخۆن و سکاڵا لەدەست زەمانە بکەن. ڕەتکردنەوە و قبوڵنەکردنی ئەو

بابەتانەی کە توانامان بەسەریاندا ناشکێت، حەزی ژیانی دایکـان تێـک دەدات و مەحکومی چاوەڕوانییەکی بێهوودەیان دەکات. دایکێـک بـا ژیـانێکی ناخۆشـی هاوسەرگیریشـی هەبێـت و خـاوەنی منـداڵێکی کەمئەنـدام و شـەکەتی دەسـتکورتیی گـوزەرانیش بێـت، دیسـانەوە ناچـارە لەنـاو هەمـوو ئەو حـاڵەتە نەخـوازراوانەدا بەدوای وردەکـارییە جـوان و دڵخۆشـکەرەکاندا بگەڕێـت.
قبـوڵنەکردن و نکـوڵیکردن لە ڕاسـتییەکان، بەتـایبەتی ئەو شـتانەی کە دەسـتی خۆمانی تێدا نییە، تەنها و تەنها حەزی ژیان کوێر دەکاتەوە. هەرچـی قبـوڵکردنی ژیانیشە وەک ئەوەی کە هەیە، تەواو پێچەوانەیە، چێژی ژیان زیـاد دەکـات و ورە دەداتە بەر مرۆڤ و دەبێتە پاڵنەرێکی مەزن بۆ ژیانێکی ئاسوودە.

بەڵام ئاگادار بن، مەبەسـتمان لە قبـوڵکردنی ژیـان وەک ئەوەی کە هەیە، ئەوە نییە بێئومێد و بێـزار و دەستەوسـان بـین. بەتـایبەت بە هـیچ شـێوەیەک مانای بێباکی ناگەیەنێت، بەڵکوو بەپـێچەوانەوە، مەبەسـتمان ئەوەیە بتوانیـت وێڕای هەموو ناخۆشییەکان، بەدەم ژیـانەوە پێبکەنیـت. ئـێمە دەزانـین زۆر جـار هەلومەرجەکانی ژیان هی ئەوە نییە بەدەمیەوە پێبکەنیـت. جـاری وایە مردنێـک، ڕووداوێکی دڵتەزێن، یان هەواڵی جیابوونەوەیەک، بە جارێک ئاسوودەیی ناخی مـرۆڤ لێـڵ دەکـات. بـۆ نمـوونە؛ ئەو دایـکەی ڕۆژێـک پێشـتر بەخۆشـی ڕۆژەکەی بردووەتە سەر، ڕەنگە بە بیستنی هەواڵی مەرگی کەسێکی نـزیکی، ئەو ڕۆژەی لێ ببێت بە کابوس. ئاخر مـردن شـتێک نیـیە، هەر وا بەئاسـانی قبوڵ بکرێت. ئەوەتا بە بەرچاوی خۆمانەوە پیربوونی نزیکەکانمان دەبینـین، کە چـۆن وەک گەڵای پـاییز یەک لەدوای یەک هەڵـدەوەرن. کەچـی لەگەڵ ئەوەشـدا ناچـارین خۆمـان فریـو بـدەین بەوەی، ئەو گەڵا وەریـوانە گەڵای درەختـی کەسـانی دیـکەن. جـا لەبـری خۆهەڵخەڵەتانـدن، ئەگەر بێتـوو بە چاوێکی واقیعییانە سـەیری ژیـان بکەیـن، ئەوکـات دەتـوانین ئاسـانتر بەسـەر

ناخۆشییەکاندا زاڵ ببین. لەبری هەڵهاتن لە ڕاستییەکانی ژیان، دەبێت لەبیریان نەکەین و بەرەو ڕوویان ببینەوە.

لە ڕاستیدا مردن بێ چارەسەرترین حەقیقەتی ژیانە، شتێک نییە چاوەڕواننەکراو بێت. جا ئەگەر مرۆڤ چاوی خۆی دابخات لە ئاست ئەمە و شتانی تری هاوشێوەی ئەمەدا و بە چەشنێک ڕەفتار بکات وەک ئەوەی کە پێشتر هیچی نەبینیوە، کاتێک خۆی لەبەرامبەریاندا دەبینێتەوە، چێژ و حەزی ژیانی گورزێکی گەورەی بەر دەکەوێت. بەڵێ، لە ژیاندا ئەگەری ڕوودانی هەموو جۆرە شتێک لەئارادایە، گرنگ ئەوەیە ئێمە چۆن ڕووبەڕووی ڕووداوەکان دەبینەوە. قبوڵکردنی ژیان وەک ئەوەی کە هەیە، حەزی ژیان زیاتر دەکات.

> **قبوڵکردنی ژیان وەک ئەوەی کە هەیە، چێژی ژیان زیاد دەکات و وره دەداتە بەر مرۆڤ و دەبێتە پاڵنەرێکی مەزن بۆ ژیانێکی ئاسوودە.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٥٠

## ٢- ئایا پایەی دایکایەتی بەخشراوە بە دایکەکە؟

ئەو ئافرەتەی کە تا دوێنێ کیژێکی گەنج بوو، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار دەبێتە هاوسەر و خاوەنی ماڵ و منداڵ. بێگومان ئەمەش لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە واتای بەدەستهێنانی ناسنامە و پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی تازەیە. دەبینیت کیژە گەنجەکەی دوێنێ، ئەمڕۆ لەناو خێزانەکەیدا بەرپرسیارێتیی بڕیاردان و جێبەجێکردنی بەسەر کەسانی تردا لەئەستۆدایە. ئیتر ئەو دایکە. دەبێت ئەندامانی خێزان بڕیارەکانی بەجددی وەربگرن. ئەگەر لەناو خێزاندا ڕۆڵی (دایکایەتی)ی دایک قبوڵ نەکرابێت و بەگرنگییەوە

له بۆچوونەکانی نەڕوانرێت، ئەوسا دەبێت بزانرێت کە فشـارێکی دەروونیی گەورە خراوەتە سەر ئەو دایکە. کاتێك لەبارەی منـداڵەکەیەوە بڕیـار دەدات، لەوانەیە تووشـی دڵەڕاوکـێ ببێـت و لە هەڵگرتنـی وەهـا بەرپرسـیارێتییەک بسڵەمێتەوە. کەچی خۆی لە بنەڕەتدا یەکێک لە خۆشترین سـاتەکانی دایک ئەو ساتانەیە، کە هەست دەکات بەرپرسیارێتیی منداڵەکەی هەڵگرتووە. بیرم دێت جارێکیان یەکێک لەوانەی سکاڵای لەدەست شەڕانگێزیی منـداڵەکەی دەکرد، ئەمەی خوارەوەی بۆ گێڕامەوە:

"ماڵە خەزوورانم هیچ کات متمانەیان پێم نەبـوو. باوەڕیـان نەدەکـرد بتـوانم منداڵەکەم بەخێو بکەم. لە کەسێتییان کەم دەکـردمەوە و لەبەر چـاوی ڕۆڵەکەمدا هەڵەکانیـان دەدایەوە بە ڕوومـدا. نە خەسـووم و نە مێردەکەشـم تێنەگەیشـتن لەوەی کە من ببووم بە دایک و هەسـتی دایکـایەتی لە نـاخمەوە هەڵـدەقوڵا. بەو شـێوەیە هەنگـاو بە هەنگـاو لەپـێش چـاوی منداڵەکەشـمدا، تایبەتمەنـدیی دایکایەتیم لەدەسـت دا. ئەوەتـا ئێسـتاش هەمـوو پـێکەوە بـاجی ئەوە دەدەیـن. کوڕەکەم لە دۆخێکدایە بە کەس هێـور نـاکرێتەوە، زۆر بزێـوە، هەموومـان گیرمـان خـواردووە بەدەسـتیەوە. خـۆ ئەگەر لەکـاتی خۆیـدا ئەرکـی سروشتیی خۆم بەجێ بهێنـایە و وەک پێویسـت سـۆز و خۆشەویسـتیم بدایەتێ، وای بۆ دەچم ئێستا گەلێـک هاوسەنگتر دەبوو."

> **ئەگەر لەناو خێزاندا ڕۆڵی (دایکایەتی)، دایک قبوڵ نەکرابێت و بەگرنگییەوە بۆ بۆچوونەکانی نەڕوانرێت، ئەوکات دەبێت بزانرێت کە فشارێکی دەروونیی گەورە خراوەتە سەر ئەو دایکە.**

منیش لەلای خۆمەوە قسەکانی ئەو دایـکە بەڕێـزە پشتڕاسـت دەکەمەوە. لە ماڵێکـدا کە دایـک هەسـت بە پـایەی

دایکــایەتی نەکــات، ئەگەری ئەوە زۆر زیــاترە منــداڵەکان ڕوو لە لاســاری و شەڕخوازی بکەن. بۆیە لێـرەوە دەڵـێم، دەبێـت ئاگـاداری ئەوە بـین بـارێکی تـر نەخەینە سەرشانی دایکان.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٦٠

## ٣- ئایا دایك سەربەستە لەوەی چۆن منداڵەکەی پەروەردە دەکات؟

یەکێک لەو بابەتانەی زۆرێـک لە دایکـان سـکاڵای لەدەسـت دەکەن ئەوەیە، ناتوانن منداڵەکانیان بەو شێوەیە پەروەردە بکەن کە خۆیان دەیانەوێت. ڕاجیاوازی لەسەر شێوازی پەروەردە لەنێوان دایک و باوک، بگرە لەگەڵ ماڵە خەزوورانیشدا، دەبێتە مایەی نیگەرانی بـۆ دایکـان. جـاری وایە منـداڵ کـۆمەڵە هەڵسـوکەوتێک دەنوێنێت، کە هەرگیز لەگەڵ ئەو شـێوازەدا یەک نـاگرێتەوە کە دایکـی لەسـەری گۆشــی کــردووە. بەو جـۆرە دایـکەکە لە هەمـان کاتـدا بەرامـبەر منـداڵەکەی و ئەوانەش کە ئەو هەڵسوکەوتەیان فێر کردووە، هەست بە بێزاریی دەکات.

یەکێـک لەو دایکــانەی کە لەنــزیکەوە دەمناســی، لەگەڵ مــاڵی خەزووریــدا دەژیــا. بــووک و خەســوو نێوانیــان زۆر خــۆش بــوو، بەڵام کە دەهــاتە ســەر کوڕەزاکەیان، کێشە لە نێوانیاندا سەری هەڵدەدا. دایـکەکە دەیویسـت لە کـاتژمێر (٧)ەوە منــداڵە حەوت ســاڵانەکەی بخەوێنێــت، بـۆ ئەوەی تێکـڕا دە کــاتژمێر بخەوێت. کەچی خەسووی پێداگریی دەکـرد درەنگـتر بیخەوێنێت، بـۆ ئەوەی چاوی بە باوکی بکەوێـت. لەبەر ئەوە بەردەوام دەمەقاڵێیـان بـوو. ئیـتر منـداڵەکە خەوەکەی دوا دەکەوت و بۆخــۆی دەکەوتە هەڵــبەز و دابەز. بێگومـــان لەو نێوەندەشــدا دەکەوتە بەر نیگــا ئاگرینەکــانی دایکــی و مەرحەمەتــی مەچەک و

بازووی! بەزمەکە ئەوەندەی تر خۆش دەبوو، کاتێك منداڵەکە -بە هـۆی درەنگ خەوتنەوە- بەیانیان بەزۆریـش خەبەری نەدەبـووەوە. لە ڕاسـتیدا ئەمەش دەبـووە هەلێک بۆ دایکەکە، تاکو تۆڵەی خەسـووی لەو بەسـتەزمانە بکـاتەوە و بەمـلا و ئەولادا ڕای بوەشێنێت و هاوار بکات بەسەریدا: "شەوان ناخەویت، بەیانیـانیش وەک لەزگە دەنوسێیت بە جێگەکەتدا و هەڵناستیت!"

لەبەر ئەوە دووپاتی دەکەیـنەوە کە زۆر خۆهەڵقورتانـدنی دایـک لە چـۆنێتیی پەروەردەی منداڵەکانیدا، دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە توانا سروشتییەکانی. کاتێك سەرقاڵی گرنگیدانە بە منداڵەکانی، وا باشـە ڕەخـــنەی برینـــدارکەری لــێ نەگـــرین و سەرنجی پەرت نەکەین. ئەگەر نا، ناتوانێت بەو شێوەیەی کە خۆی دەیەوێت هەسـتێت بە ئەرکـــی دایکـــایەتی. بێگومـــان هـــیچ دایکێکیش ئەمەی بەلاوە پەسەند نییە.

**دەستوەردانە کاروباری دایک لە چۆنێتیی پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا، دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە توانا سروشتییەکانی.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٤٠

## ٤- ئایا دایك چوار ساڵی یەکەمی تەمەنی لە دایکی خۆی دوور بووە؟

چوار ساڵی یەکەمی تەمەن لەوپەڕی گرنگیدایە لەو ڕووەوە، کە ئایا ئەو منداڵە لە کەشێکی پڕ دڵنیایی و ئاساییشدا گەورە بووە یان نا. تا چوار ساڵی، منـداڵ بەو هەستی دڵنیاییەی کە لە دایکییەوە وەری دەگرێت، کەسێتیی خۆی بنیات دەنێت. بناغەی بەشێکی بەرچاوی کەسێتیی منداڵ، لەم قۆناغەدا دادەنرێت. ئەگەر دایك لەم قۆناغەدا -کە قۆناغی پێکهاتنی کەسێتییە- لە دایکـی دوور بووبێـت، ئەگەری

زۆره هەستی دڵنیایی تیایدا گەشەی نەکردبێت. بۆیە ئەستەم نییە لە گەورەییدا ببینی متمانەی بە هاوسەرەکەی نەبێت، یان سکاڵا لەدەست بێئەمەکیی منداڵەکەی بکات، چونکە گومانی وایە لە داهاتوودا ڕەنج و ماندووبوونەکانی بەبا دەچن. لێرەدا بیرمان نەچێ کە سەرچاوەی هەموو ئەم نامتمانەی و گومانانە، دەگەڕێنەوە بۆ منداڵیی دایکەکە خۆی. خۆ ئەگەر لە پاشخانی ڕاستەقینەی ئەم هەستەی دایک تێنەگەین، ئەوسا ماڵەکانمان بەدوور نابن لەوەی بەردەوام ببنە شانۆی پێکهەڵپژان و ئاڵۆزی. ئەگەر هاتوو دایک پەی بەم کۆڵەی سەرشانی برد، ئەوا دەبێت بکەوێتە ململانێ لەگەڵیدا.

هیچ شتێک لەوە ناخۆشتر نییە، مرۆڤ هەست بە نەبوونی متمانە و دڵنیایی بکات لە خۆیدا. چونکە بەڕاستی مێشکی مرۆڤ بەرگە ناگرێت ئەگەر بەبەردەوامی لە چاوەڕوانی ڕووداوێکی خراپدا بێت. ئەگەر دایک بتوانێت ئەم هەستە نەرێنییە لەکۆڵ خۆی بکاتەوە، ئەوا بە چاوێکی ترەوە دەڕوانێتە ژیان و دایکایەتی چێژێکی تری دەبێت.

بەڵێ: ٥٠

نەخێر: سفر

## ٥- ئایا دایکەکە بەهای مەعنەوی هەیە؟

ئەوانەی لەناو پرۆسەکەدان، دەزانن کە پێگەیاندنی منداڵ ئەوەندەش ئاسان نییە وەک لەدەرەوە دەبینرێت. تاوەکو ئێستا گوێم لە دایکێک نەبووە بڵێت: "خودا نەیبڕێ، زۆر بەئاسانی دێت بەدەستمەوە." پێشم وایە زۆربەی دایکان هاوڕان لەگەڵمدا. شیرینترین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا قورسترین ئەرکی دنیایە. جاری وایە قورسایی ئەم ئەرکە بە چەشنێک تەنگ بە دایک هەڵدەچنێت، لەتاو بێچارەیی خۆی دەچێتە سووچێکەوە و بە کامی دڵ دەگری. جا ئەگەر

پەنـــاگەیەکی مەعنەویـــی هەبێـــت، لەو حاڵەتـــانەدا دەتوانێـــت لە ڕووی دەروونییەوە هەناسەیەک بدات. جارێکیان دایکێک پێی وتم: "هەندێك جـار ئەوەندە نـارەحەت دەبـم، خـۆم دەخـزێنمە ژوورەکەمەوە و دەسـت دەکەم بە گریان. لەلایەکەوە بە خۆم دەڵێم کە نابێـت بـبمە دیلـی تـووڕەییەکەم و پەنـا ببەمە بەر توندوتیژی، لەلایەکی دیکەشەوە ڕەفتـاری منـداڵەکەمم پـێ قبـوڵ ناکرێت. لەو کاتانەدا تاکە داڵدە و دڵدەرەوەم دوعایە. تەنها بە دوعـا دێـمەوە سەر خۆم و ئارام دەبمەوە."

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٨٠

## ٦- ئایا دایك پەروەردەی خێزانێکی توندوتیژە؟

یەکێـک لە خەسـڵەتەکانی تونـدوتیژی بـریتییە لە (گواسـتنەوەی بـۆ وەچەکـان). واتە، ئەو منـداڵە سـتەملێکراوەی ئەمـڕۆ تونـدوتیژی بەرامـبەر دەکرێت، هەر ئەوە سبەینێ دەبێتە ستەمکار و چاو سوور دەکـاتەوە و مسـتی گرمۆڵە دەکات. توێژینەوەکان دەریان خستووە ئەو دایکـانەی لە منداڵییانـدا بەرەو ڕووی لێدان و توندوتیژی بوونەتەوە، کاتێـک دەبـن بە دایـک زۆرجـار هەمان شت بەرامبەر منداڵەکانی خۆیان دووبارە دەکەنەوە.

لە سەروبەندی گفتوگۆم لەگەڵ یەکێک لەو دایکانەی کە سـکاڵای لەدەسـت دۆخی خراپـی ڕۆڵەکەی دەکـرد لە قوتابخـانە، ئەوەم بـۆ دەرکەوت کە خـۆی لە منداڵیـدا تووشـی تونـدوتیژیی زۆر بـووەتەوە. ئەم دایـکە بڕیـاری دابـوو ڕێـگە نەدات منـداڵەکانی هەمـان ئەزمـوونی تـاڵی منـداڵیی خـۆی بچێـژنەوە، بـۆیە تەنانەت یەک جـاریش چییە دەسـتی لـێ بەرز نەکردبـوونەوە. بەڵام لە درێـژەی قسـەکانیدا بـۆم دەرکەوت کە ئەم دایـکە، لەبـری (تونـدوتیژیی جەسـتەیی)،

شـێوازی؛ تـۆران، دەنگـدابڕین، بەنـدکردن لە ژوورێکـدا، لەگەڵ منداڵەکانیـدا پەیڕەو دەکـات، کە هەر یەک لەوانەش بۆخـۆی دەچێتە خـانەی (تونـدوتیژیی دەروونی)یەوە. ئاخر تونـدوتیژی تەنهـا تێهەڵـدان و ئـازاردانی جەسـتەیی نیـیە، چونکە توندوتیژیی سـۆزداری و سـایکۆلۆژی هێنـدەی تونـدوتیژیی جەسـتەیی شوێنکاری قووڵ لەسەر کەسێتیی منداڵ جـێ دەهێڵێـت. زویربـوونی دایـک لە منـداڵەکەی و سـزادانی لە ڕووی سـۆزدارییەوە، بەرگـێکە لە بەرگەکـانی تونـدوتیژی. لە ئەنجـامی بەردەوامیـی دانیشـتنەکانمان، دایـکەکە لە هەڵەکەی تێگەیشت و بڕیـاری دا بەخۆیـدا بچێتەوە. ئەوەی جێـی سـەرنجە پـاش چەنـد هەفـتەیەک کە یەکترمـان بینیـیەوە، پێـی وتـم کە بە هـیچ جۆرێـک ناتوانێـت دەستبەرداری سزای سـایکۆلۆژی و سـۆزداری ببێـت و زۆر لە خـۆی دەکـات: "بـێ ئەوەی هەسـت بە خـۆم بـکەم، بە شـێوەیەك ئـالوودەی بەکارهێنـانی توندوتیژیی سایکۆلۆژی بووم، دەڵێـی ئەوانەم کە چارەسـەری دوورکەوتـنەوە لە مادده هۆشبەرەکان وەردەگـرن. هەر چەنـد زۆر لە خـۆم دەکەم، کەچـی خۆم پێ ناگیرێت. هەرگیـز بیـرم لەوە نەدەکـردەوە ئەوەنـدە قـورس بێـت. لە کاتێکدا پێشتر شانازیم بەوەوە دەکـرد، کە هەرگیز ئازاری منداڵەکانم نادەم."

**ئەو منداڵە ستەملێکراوەی ئەمڕۆ توندوتیژیی بەرامبەر دەکرێت، هەر ئەوە سبەینێ دەبێتە ستەمکار و چاو سوور دەکاتەوە و مستی گرمۆڵە دەکات.**

بەڵێ: ٤٠

نەخێر: سفر

## ٧- ئایا لە ڕابردوودا ئەو دایکە تووشی گێچەڵی سێکسی بووتەوە؟

بەداخەوە دەڵێم، پایەکانی بەها و ئەخلاق لە کۆمەڵگەکانی ئەمڕۆدا لە زۆر لایەنەوە دوچاری لەرزین و داخوران بوونەتەوە. ئەوانەی دوێنێ قوربانیی دەستدرێژی و لاقە بوون، وا ئەمڕۆ بوونەتە دایک. بۆیە کاتێک دایکان بەخۆیاندا دەچنەوە، دەبێ ئەو خاڵە هەستیارانەش لەبەرچاو بگرن، کە لە ڕابردوودا بەسەریاندا هاتووە. پێویستە لە ڕێی پشکنینی دنیای هەستەکانیانەوە دەست بخەنە سەر کاریگەریی هەنووکەیی ئەو ڕووداوە نەخوازراوانەی لە ڕابردوودا ڕوویان داوە. چونکە ئەگەر دایک بەو یادەوەرییە تاڵانەوە -کە لە خودی خۆیشی دەشارێتەوە- دایکایەتی بکات، ئەوا زۆر جار بە تووڕەیی و بێتەحەمولی دەجووڵێتەوە. دروست نییە سەرتاپای تەمەن بکرێتە قوربانی بەسەرهاتگەلێک، کە لە ڕابردوودا ڕوویان داوە. ڕەنگە مەحاڵ بێت یادەوەرییە تاڵەکان لەیاد بکەین، بەڵام بیرمان نەچێت هەموو کات دەتوانین کۆڵی قورسی ئەو ڕووداوانە لە سەرشانی خۆمان سووک بکەین.

> **ڕەنگە مەحاڵ بێ یادەوەرییە تاڵەکان لەیاد بکەین، بەڵام بیرمان نەچێت هەموو کات دەتوانین کۆڵی قورسی ئەو ڕووداوانە لە سەرشانی خۆمان سووک بکەین.**

**گێچەڵ**

بەڵێ: ٩٠

نەخێر:سفر

**لاقە**

بەڵێ: ١٩٠

نەخێر: سفر

## ٨- ئایا هاوکاریی پێویست لە خێزانەکەیەوە وەردەگرێت؟

پێگەیاندنی منداڵ ئەرکێك نییە، بەتەنها شان بدەیتە بەری. با دایک بە جوانترین شێوەش خەریک بێ، بەڵام ئەگەر هەر خۆی بێت، کەموکورتی دێتە ئاراوە. هەر چۆنێک بووە دەبێت باوکیش لەم پرۆسەیەدا بەشدار بێت. ڕەنگە هۆکاری ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆر زەحمەتە دایک و باوک جێگەی یەکتری بگرنەوە. بەتایبەت کوڕان لە قۆناغی پێگەیشتندا -بەزۆری- کەسێتیی باوک دەکەنە مۆدێل و سەرمەشقی خۆیان. هەوڵ دەدەن وەک ئەوان قسە بکەن و وەک ئەوان بجووڵێنەوە. خۆ ئەگەر دایک تەنها خرابێت و بەبێ یارمەتیی باوک خەریکی منداڵەکانی بێت، ئیدی ئەودەم دەبێت چاوەڕێی گرفتی پەروەردەیی بکەین.

لە لایەکی ترەوە، کە لە سۆنگەی هەلومەرجەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆوە بۆ مەسەلەکە دەڕوانین، دەبینین باوکانیش ئەرکیان گرانتر بووە؛ تا درەنگانێک لەسەر کارن، جاری وایە کۆتایی هەفتەش ناچارن بچن بۆ سەر ئیش. لەو حاڵەتانەدا پێویستە دایک و باوک بەشوێن کۆمەڵە ڕێوشوێنێکدا بگەڕێن، کە ڕۆڵی باوک کاراتر دەکات لە پێگەیاندنی منداڵەکانیدا. چوارچێوەبەندیی کات و پەیڕەوکردنی بنەمای (کاتبەسەربردنی بەرهەمدار) یاریدەدەرێکی باشە بۆ دەستەبەرکردنی ئاڵوگۆڕی سۆزداری نێوان باوک و منداڵ. هاوکات توێژینەوەکان جەخت لەسەر ئەو جیاوازییە بەرچاوە دەکەنەوە، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەنێوان خێزانە خاوەن دوو منداڵ و یەک منداڵەکاندا هەیە. ئاشکرایە تا ژمارەی خوشک و برا زیاتر بێت، کەسێتیی منداڵ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زیاتر بەهێز دەبێت. خێزان چەندە قەرەباڵغ بێت، منداڵ ئەوەندە توانای کۆمەڵایەتی بەدەست دەهێنێت. لە ڕوانگەی دایکیشەوە هەر هەمان شتە، بەخێوکردنی دوو منداڵ یان سێ، لە بەخێوکردنی دانەیەک ئاسانترە.

جگە لەمە، بوونی نەنک و باپیری (هۆشیار)یش یاریدەدەرێکی نایـابە بـۆ کەمکردنەوەی بارگرانیی سەرشانی دایک. منداڵی تاقـانە، بەردەوام پێویسـتی بە بـــایەخی دایکییەتـــی. کەچـــی ئەو منـداڵەی لە خێزانێکـــی قەرەباڵغـــدایە، ئەگەر دایکی دەستی گیرابوو، بۆخۆی دەچێـــت لەگەڵ خوشـــک و براکانیـــدا یاری دەکات، یـــان بە ئەنـــدامانی تـــری خێزانەوە خۆی سەرقاڵ دەکات.

لە گۆشکردنی منداڵدا، پێویستە باوکانیش هاوشانی دایکان بەشدار بن، چونکە کەسیان ناتوانێت جێگەی ئەوی تریان پڕ بکاتەوە.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٣٠

## ٩- ئایا بە ویستی خۆی بووە بە دایك؟

هاتنە دنیای منداڵ، گەورەتـرین گۆڕانکـارییە لە ژیـانی هەمـوو ئافرەتێکـدا. ئاخر ئەو تەنها بە جەستە بە کۆرپەکەیەوە نەبەستراوە، لە هەمان کاتـدا وابەسـتەیی زیهنـــی و ســـۆزداری و هۆرمـــۆنیش هەیە لەنێوانیانـــدا. لەم ڕووەوە بـــۆ ئەوەی بتوانێت دایکایەتی بکات، زۆر گـرنگە هەسـت بەوە بکـات کە ئامـادەیی تێـدایە ببێت بە خاوەنی منداڵ. خـۆ ئەگەر بەبـێ ویسـتی خـۆی منـداڵی بـووبێ، ئەوا ڕەنـگە دوچـاری جۆرێـک لە شـەکەتیی دەروونـی ببێـت، چـونکە ئیـتر ناچـارە ســـەرجەم کارەکـــانی؛ خەوی، مەوعیـــدەکانی، دیـــدەنی دۆســـتانی... هتـــد. بەگوێرەی میـوانە چـاوەڕواننەکراوەکەی ڕێـک بخـات. تەنـانەت بـۆی هەیە بەو چاوەوە سەیری میوانە شـیرینەکەی بکـات، وەک ئەوەی ژیـانی لـێ کردبێـت بە زیندان. بەو هۆیەوە دەبێت چاو بە بەرنامە و پلانەکانی داهاتوویـدا بخشـێنێتەوە، دوور نییە ئۆباڵی ئەوەش بخاتە ئەستۆی منداڵەکەی. لەبەر ئەوە، زەحـمەتە وەهـا

منداڵێک بەهرەمەند بێت لە پەروەردەیەکی تەندروست. لە لایەکی ترەوە، لەوانەیە دایک بە شێوەیەك بەرنامەڕێژیی کردبێت کە یەک منداڵ یان دووانیان بێت، بەڵام کاتێك دووانە یان سیانەیان دەبێت، پلانەکانی دایک سەرەوژێر دەبنەوە. لەم جۆرە حاڵەتانەدا، دەبێت دایک شرۆڤە و لێکدانەوەی پێشهاتەکان وەلا بنێت و هەوڵ بدات خۆی لەگەڵ دۆخەکەدا بگونجێنێت، پێویست ناکات وزەی خۆی بە شتی بێهودەوە بەفیڕۆ بدات. وا باشە لەبری ئەوە، جەخت بخاتە سەر ئەو هەنگاوانەی ژیانی خۆشتر دەکەن. گومانی تێدا نییە بژاردەی دووەم کارێکی ژیرانەترە.

**پێویستە دایکان شرۆڤە و لێکدانەوەی پێشهاتەکان وەلا بنێن و هەوڵ بدەن خۆیان لەگەڵ دۆخەکەدا بگونجێنن. پێویست ناکات وزەی خۆیان بە شتی بێهودەوە بەفیڕۆ بدەن. وا باشە لەبری ئەوە، جەخت بخەنە سەر ئەو هەنگاوانەی کە ژیانیان خۆشتر دەکات.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٢٠

## ١٠- ئایا لە دڵەوە کۆرپەکەی قبوڵ کردووە؟

دەڵێن ژیشک بە بەچکەکەی دەڵێت: "مەخلوق هەیە هێندەی تۆ نەرمونۆڵ بێت!" دایک حەز بکات یان نا، کۆرپەی خۆی خۆش دەوێت. بەڵام خۆشویستن شتێکە، لە دڵەوە قبوڵکردنیش شتێکی تر. چەند ساڵێک پێش ئێستا قسەم لەگەڵ خانمێکدا کرد، کە لە تەمەنێکی گەنجدا ببوو بە دایک. قسەکانی تاوەکو ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە:

"قوربانی هەناسەیەکی جەرگەکەم بم، زۆرم خـۆش دەوێـت. بەڵام لەبەر ئەوەی زوو بـووم بە دایـک، هەسـت دەکەم چێـژم لە گەنجێتـیم نەدیـوە. زۆربەی هاوڕێکـانم تەنـانەت شووشـیان نەکـردووە، بـۆیە کە بە خـۆم و منداڵێکەوە دەچمە ناویان، سەریان سوڕدەمێنێت. ڕاستییەکەی خۆشم بـاوەڕ ناکەم بوومبێتم بە دایک."

ئەگەر دایـک هێشـتا نەگەیشـتبێتە ئەو قەنـاعەتەی کە ئیـتر ئەو بـووە بە دایک، مەحاڵە لە ناخەوە دڵی بە منداڵەکەی خۆش بێـت. ئاشکراشـە، وەهـا دایکێک کۆڵێکی گرانی هەڵگرتووە. دیسـانەوە دەمەوێ سـەرنجتان بـۆ لای وتەی دایکێک ڕابکێشم:

"کە کچەکەم بـوو بە سـاڵێک، ناچـار بـووم بگەڕێـمەوە سـەر کـار. لای خەسووم دام دەنا. کە ئێواران دەگەڕامەوە، لەتـاو مانـدوویێتی هەر ئەوەنـدەم پێدەکرا تێـری بـکەم و بیخەوێـنم. ئەم دۆخە هەشـت سـاڵی تەواو درێـژەی کێشا. دواتر منداڵی دووەممان هاتە دنیاوە. بەناچاری وازم لە کـارەکەم هێنـا. کاتێـک دوای هەشـت سـاڵ بـۆ یەکەم جـار لەگەڵ کچەکەمـدا مـاوەیەکی زۆرمان پێکەوە بردە سەر، هەستم کرد هەردووکمان نامۆین بە یەکتری."

جگە لەمە، دڵخۆشبوونی باوکیش بە منداڵ زۆر گرنگە. ڕاستە بەدەگمەن دایکـان ئەم حاڵەتەیـان بەسـەردا دێـت، بەڵام زۆر جـار ئەمە لە بـاوک و کەسـوکاری باوکـدا دەبینرێـت. لە چاوپێکەوتنێکـدا لەگەڵ یەکێـک لەو دایکانەی هەوڵی خۆکوژی دابوو، بیسەری ئەم چەند دێڕە بووین:

"مـن بەبـێ ڕەزامەنـدیی خێـزانەکەم شـووم کـرد. بەو هـۆیەوە، بـاوکم بەیەکجاری دەنگی لێ دابڕیم. دواتر چەند منداڵێکم بـوو، بەڵام خێـزانەکەم چـارەی ئەوانیشـیان نەدەویسـت. بەتـایبەت بـاوکم، یەک جـاریش چییە نەوەکانی لەباوەش نەگرت. فشاری خێزانەکەم لە لایەک و گرفتەکانی ژیـانی

هاوسەرێتی لە لایەکی تر، ژیانمیان شپرزە کردبوو. لەبەر هەستی تەنهایی و بێکەسی، هەوڵی خۆکوشتنم دا."

بەدەر لەو نموونانەی سەرەوە، هەندێك جاری دیکە دایک ڕواڵەتی دەرەکی یان هەندێك ئەندامی منداڵەکەی دەکات بە گرفت. بۆ نموونە؛ ڕەنگە بڵێ: "لووتی زۆر گەورەیە"، "زۆر توکنە." ئیتر بەو جۆرە دووری دەخاتە نێوان خۆی و منداڵەکەیەوە. ئەو ئافرەتەی دەست دەبات بۆ ئەو جۆرە بیرکردنەوە ژەهراوییانە، بێ هیچ هۆیەک کۆڵێکی قورس بۆ سەرشانی خۆی زیاد دەکات و باری دەروونی خۆی دەخاتە ژێر فشارەوە. لەگەڵ گەورەبوونیدا، منداڵەکەشی لەو تێڕوانینەی دایکی بێزار دەبێت و وەک (منداڵێکی گرفتاوی) هەنگاو دەنێتە ژیانەوە.

> ئەگەر دایک هێشتا نەگەیشتبێتە ئەو قەناعەتەی کە ئیتر ئەو بووە بە دایک، مەحاڵە لە ناخەوە دڵی بە منداڵەکەی خۆش بێت.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٤٠

## ١١- ئایا هاوسەرەکەی خۆش دەوێت؟

(خۆشویستران) چەندە پێویستی بێت، (خۆشویستن)یش ئەوەندە پێویستییە. ئەگەر هاتوو دایک هەستی بە خۆشەویستیی مێردەکەی نەکرد -لەگەڵ ئەوەشدا کە مێردەکەی خۆشی دەویست- پەروەردەی منداڵ دەکەوێتە مەترسییەوە. ئەگەر دایک لەبەر ناچاری درێژە بە ژیانی هاوسەری بدات و هەستی سۆزداری نەبێت بۆ هاوسەرەکەی، زۆربەی کات دەکەوێتە هەڵەوە لەگەڵ منداڵەکەیدا،

چونکە ئازاری خۆشنەویستنی مێردەکەی و فشاری بۆشاییە سۆزدارییەکەی بە منداڵەکەی دەردەبڕێت. هەموو ڕەفتارێکی منداڵانەی کچەکەی/کوڕەکەی لەبەر چاو گەورە دەبێت و وا دەکات کاردانەوەی شەڕانگێزانەی هەبێت.

لەپاڵ ئەمەدا، جاری وا هەیە دایکەکە هاوسەرەکەی خۆش دەوێت، بەڵام لە ناخی دڵیەوە پێی دڵخۆش نییە، کە ئەمەش بۆخۆی گرفتە. مەرج نییە هەموو خۆشەویستییەک، هۆگریی دەروونی لەگەڵدا بێت. ئەگەر دایکەکە سەرباری خۆشویستنی مێردەکەی، جاروبار (خۆزگە و خۆزگەکاری) دەکرد، مانای وایە بەتەواوی هۆگری مێردەکەی نەبووە. دیارە لەم دۆخەشدا کۆڵی سەرشانی دایک قورستر دەبێت.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٧٠

## ١٢- ئایا لەلایەن مێردەکەیەوە خۆش ویستراوە؟

بەبێ بوونی خۆشەویستی، باس لە پەروەردەی منداڵ ناکرێت. باسیش بکرێت درێژخایەن نابێت. ئەو دایکەی لەلایەن هاوسەرەکەیەوە خۆشەویستیی نادرێتێ، بەزەحمەت دەتوانێت خۆشەویستی بدات بە جگەرگۆشەکەی. ڕاستە خۆشەویستیی مێرد و خۆشەویستیی منداڵ دوو شتی جیاوازن، بەڵام ئەو دایکەی خۆشەویستیی مێردەکەی وەردەگرێت، بەئاسانی ئەو وزە ئەرێنییە دەگوازێتەوە بۆ منداڵەکەی.

> **ئەو دایکەی لەلایەن هاوسەرەکەیەوە خۆشەویستیی نادرێتێ، بەزەحمەت دەتوانێت خۆشەویستی بدات بە جگەرگۆشەکەی.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٤٠

## ١٣- تا چ ئاستێك دایك ئالوودەی ئامێرە تەکنەلۆژییەکانە؟

ئالوودەبوون بە جیهانی تەکنەلۆژیاوە، یەکێکی ترە لەو مەترسییانەی خۆی بـۆ دایکان مەڵاس داوە. بەداخەوە، خێرایی سەرسـوڕهێنەری تەکنەلۆژیـا، چەنـدین میوانی بانگهێشتنەکراو دەهێنێتە ماڵەکانمـانەوە. بە دەربڕینێکـی تـر، دەرگـای ماڵەکانمان بە ڕووی دەرەوەدا دەخاتە سەرپشت.

ئینتەرنێـت و مۆبایـل و یـارییە ئەلەکترۆنییەکـان، کە بە هێواشـی دزەیـان کـردووەتە نـاو خێزانەکانمـانەوە، چەنـدە هەڕەشـەن بـۆ سـەر منـداڵەکانمان، ئەوەنـدەش هەڕەشـەن بـۆ سـەر دایکـان. جـاری وایە لە کـاتی بەکارهێنانیانـدا، ئاگای لە خۆی نامێنێت کە چەندە کاتی پێوە کوشتووە. بۆ نمـوونە؛ ئەو دایـکەی بە تەلەفۆن لەگەڵ دۆست و ئازیزاندا بە ئیسراحەتی خۆی قسە دەکـات، هەسـت بەوە ناکات لەو کاتە دیاریکراوە دەخـوات کە بـۆ منـداڵەکەی تەرخـان کـردووە. لەو کـاتەدا کە پێویسـتە لەگەڵ منداڵەکەیـدا کـات بەسـەر بەرێـت، زەنگـی تەلەفۆنێـک ئەو پێکەوەیـیە دەپچڕێنێـت. خـۆ ئەگەر هەسـتین بە شـیکاری ئەو ماوەیەی کە بە تەلەفۆنکردن بەسەری دەبەین، بۆمـان دەردەکەوێـت کە زۆربەمـان -بێ ئەوەی بە خۆمان بـزانین- بـووینەتە (ئـالوودەبووی تەلەفـۆن). هاوشـێوەی ئەمانە، ئاڵوگۆڕی کورتەنامە و وێنە و ڤیـدیۆ، هەروەهـا سـەرقاڵبوونی بەردەوام بە تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکـانەوە، هەسـتی چـاوەڕوانی و مـاخۆلانی زانـین لە مرۆڤـدا دەبزوێنن. ئەم چاوەڕوانییەش، خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ئالوودەیی پەنهان.

ئەو دایکانەی ڕۆچوونەتە ناو دنیای تەکنەلۆژیـاوە، زۆربەی جـار مـاڵ و منداڵ و هاوسەرەکانیان فەرامۆش دەکەن. دایکێکی لەو شـێوەیە، چـاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت پەیوەندییەکی تەندروست لەگەڵ منداڵەکەیـدا ببەسـتێت. مۆبایل گرتنەدەست و چـوونە نـاو تـۆڕی ئینتەرنێـت بـۆ ئەو دایکـانە، وەک ئەو

مـۆرفین وایە کە ئـالوودەبووی مـاددە هۆشـبەرەکان دەیـدات بە جەسـتەی. هەر گەردیلەیەکـی مـۆرفین، هەسـتی پێویسـتی بە دانەیەکـی تـر دەبزوێنێـت. هەر گفتوگۆیەک و ناسـینی کەسـێکی تـازە لە ئینتەرنێتـدا، ڕێخۆشـکەرە بـۆ ناسـینی کەسێکی تـر و کەسـێکی تـر. ئەمەش هەنگـاو بە هەنگـاو، دایـک پەلکێشـی کەناری تیاچوون دەکات. بەڵێ، دەڵـێم تیـاچوون، چـونکە لە ئەنجـامی ئەو دانیشتنە دەروونییانەی لەگەڵ ئەو جـۆرە دایکـانەدا ئەنجـاممان داوە، بۆمـان دەرکەوتـووە کە چارەسـەری ئەوان لە چارەسـەری ئەو کەسـانە قورسـترە، کە ئالوودەی ماددە هۆشـبەرەکانن. بەداخەوە، چـاوەڕێی دایکـایەتی و پەروەردە لەو دایکانە ناکرێت.

بەڵێ: چل

نەخێر: سفر

## ١٤- ئایا دایك جگەرە و ماددە کحولی و هۆشبەرەکان بەکار دەهێنێت؟

بەکاربردنی جگەرە و ماددە کحولییەکان لە تەمەنی گەنجێتییەوە، زیانێکی زۆر بە ئەرکی دایکایەتی دەگەیەنێت. لێکۆڵینەوەکـانی ئەم دوایـیە، بەڕوونـی تیشـک دەخەنە سەر کاریگەرییە نەرێنییەکانی خـوویەکی ئاسـایی! وەک؛ جگەرەکێشـان لەسەر باری دەروونیی مـرۆڤ. ئەوە بـا لەولاوە بوەسـتێت کە کۆئەنـدامەدەماری بەکاربەرانی جگەرە، لە کەسانی ئاسایی هەسـتیارترە و جەستەشـیان مانـدووترە. سەرباری بەرپرسیارێتی و ئەرکی سروشتیی دایکـایەتی، دایـک دێـت و لە ڕێـی جگەرە و ماددەی هۆشبەرەوە بارێکی تری جەسـتەیی و زیهنـی بـۆ خـۆی زیـاد دەکات و خۆی و منداڵەکەشی دەخاتە مەترسییەوە. هەنـدێك دایـک پێیـان وایە خواردنەوەی کەمێک مەی، دەبێتە هۆی خاو بوونەوە و ئاسـوودەیی و بەو جـۆرە

دەتــوانن خۆشــمامەڵەتر بــن لەگەڵ منداڵەکانیانــدا. بەڵــێ، ڕاســتە مەی پەرچەکردارەکــانی جەســتە کەم دەکــاتەوە، بەڵام دایکــایەتی ئەرکێــک نیــیە بە هۆشمەندییەکی لاوازەوە ئەنجام بدرێت. دەبێت وەڵامدانەوە جەستەیی و توانا هزرییەکانی دایک لە بەرزترین ئاستدا بن. بە بیر و هۆشێکی پەرتوبڵاوەوە، دایک دەستەوســان دەبێــت لە وەڵامــدانەوەی ئەو پرســیارانەی کە منــداڵێکی مێشــک چالاک دەیانکات. ئەمە جگە لەوەی کە وەڵامی چەوت و ناتەبا، پێگەی دایک لە چاوی منداڵەکەیدا دەخاتە ژێر پرسیارەوە. پێویســتە دایــک بەچێــژەوە چــاودێریی منداڵەکەی بکات و لە هەموو قۆناغێکیدا بە بیــر و هۆشــێکی چــالاکەوە لەگەڵیــدا بدوێت. ئەگەر دایک بەســەرگەرمکردن بە مەی و ماددەی هۆشبەرەوە ئەو قۆناغانەی تێپەڕاندبێت کە منداڵ لەوپەڕی ئاتاجیدایە پێی، ئەوا وەختێ بەهۆش خۆیدا دێتەوە و ئــاوڕ دەداتەوە بــۆ ڕابــردووی، هەســتی پەشــیمانی زۆر گــران لەســەر ویژدانــی دەکەوێت.

> **دایکایەتی ئەرکێک نییە بە هۆشمەندییەکی لاوازەوە ئەنجام بدرێت. دەبێت وەڵامدانەوە جەستەیی و توانا هزرییەکانی دایک لە بەرزترین ئاستدا بن.**

**ماددەی هۆشبەر:**

بەڵێ: ٩٠

نەخێر: سفر

**جگەرە:**

بەڵێ: ٢٠

نەخێر: سفر

## ١٥. ئایا وەك پێویست ئەزموونی کۆمەڵایەتیی هەیە؟

شتێکی سەیر نییە کە دوای ئەوەی ئـافرەت دەبێـت بە دایـک، هەمـان ئەو سەربەستییە کۆمەڵایەتییەی نامێنێت کە پێش منداڵبوون هەیبووە. ڕەنگە وردە وردە بەسەر خۆیدا دابخرێت و ناچار بێـت لە دۆسـت و خـزمە دوورەکـانی دوور بکەوێتەوە. چەندەش لە ڕووی ئەم گۆڕانکارییە سروشتییەدا بوەستێت، ئەوەندە هەست بە تێکشـکان دەکـات لە ڕۆحیـدا. پێـداگریی دایـک لەسـەر دووبارەکردنەوەی ئەزمـوونی سـەردەمی گەنجێتـی، تەقەلایەکـی بێهـوودەی ئەوتۆیە، زیان بە خۆی و منداڵەکەشی دەگەیەنێت. بۆ نموونە؛ دەبێت بزانێت کە گەشتی دووررودرێژ و بازاڕکردنی چەند کاتژمێری بە منـداڵی بچـووکەوە، کۆمەڵە گرفتێک بەدوای خۆیدا دەهێنێت. بۆیە وا باشترە دایکان نیگەران نەبن بەم ئاڵوگۆڕە لە دۆخی کۆمەڵایەتییاندا.

بەپێچەوانەی ئەمەوە، دایکان دەتوانن ئەو ژینگە تازەیە لە دۆست و خزمان کە بە هۆی لەدایکبوونی منداڵەکەیەوە دەستی کەوتووە، بکات بە جێگرەوەی ئەو پانتاییە کـۆمەڵایەتییەی کە پێشـتر هەیبـووە. لەپـاڵ ئەمەشـدا، دەتوانێـت بەشداریی کار و چالاکی خۆبەخشانە بکات و ژیانی هەمەڕەنگتر بکات.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٢٠

## ١٦- ئایا دایك بەهەڵپە و تووڕەیە؟

ئاشکرایە هەنـدێك هەڵسـوکەوت لە کەسـێتیی مرۆڤـدا بە تێپەڕبـوونی کـات جێگیـر دەبێـت، بەڵام هەنـدێك تایبەتمەنـدیی کەسـێتی هەیە مـرۆڤ لە سـکی دایکـیەوە دەیانهێنێـت. لە پێشـەکیی ئەو تایبەتمەنـدییانەش، هەڵـپە و تـووڕەییە. ئاڕاستەکردنی دروسـتی ئەم هەسـتانە، کۆگـایەکی گەورەی وزەیە لە پێگەیانـدنی

منداڵدا. دەتوانین بڵێین ئەو دایکەی پەرۆشی جوان پێگەیاندنی ڕۆڵەکەیەتی، ئەم تایبەتمەندییەی بە ئاقارێکی دروستدا ئاڕاستە کردووە. چاوم بە دایکێک کەوت لە چلەکانی تەمەنیدا، تازەبەتازە ڕێی لە شێوازی زانستییانەی پەروەردەی منداڵ کەوتبوو. هەڵەکانی ڕابردووی خستبووە کەنارێکەوە و پەرۆش و بەهەڵپە بوو بۆ ئەوەی چیدی دووبارەیان نەکاتەوە. هەڵپە و پەرۆشییەکەی بووە هۆی ئەوەی ڕوو بکاتە شێوازی پەروەردەی دروست، ئەگەرچی لە نیوەی ڕێگاشدا بێت.

لەبەرامبەردا، مامەڵەی ناتەندروست لەگەڵ ئەو دوو تایبەتمەندییەدا، شوێنەواری نەرێنی لەسەر دایک جێ دەهێڵن. ئەگەر دایک هەڵپە و تووڕەییەکەی کۆنترۆڵ نەکرد، زیاد لەوەش بەرامبەر منداڵەکانی بەکاری هێنا، مانای وایە کەوتووەتە ناو گێژاوی توندوتیژییەوە و خەریکە تیایدا دەخنکێت. لە بنەڕەتدا دەبێت دایک تووڕەییەکەی ئاڕاستەی ئەو دەستانە بکات کە بۆ منداڵەکەی درێژ دەکرێن، نەوەک منداڵەکە خۆی. بۆیە ئەگەر بە هەر جۆرێک ئەو تووڕەییە ئاڕاستەی دەرەوە نەکرا، ئەوا یەکەم ناونیشان کە ئەو هەستەی تێدا بەتاڵ دەکاتەوە، منداڵەکەیەتی.

> **ئەگەر دایک هەڵپە و تووڕەییەکەی کۆنترۆڵ نەکرد، زیاد لەوەش بەرامبەر منداڵەکانی بەکاری هێنا، مانای وایە کەوتووەتە ناو گێژاوی توندوتیژییەوە و خەریکە تیایدا دەخنکێت.**

بەڵێ: ٣٠

نەخێر: سفر

## ١٧- ئایا دایك پەروەرشیارێكی هۆشیارە؟

خۆی لە ڕاستیدا پەروەردەی منداڵ پسپۆڕییە. لەولایشەوە دەبینیت ئەستەمە دایکان شارەزای هەموو شتێک بن. لە ئێستادا پەروەردەی منداڵ لقێکی سەربەخۆی زانستە. شارەزایانی بوارەکە لەنزیکەوە چاودێریی توێژینەوە زانستییەکان دەکەن، دواتریش دەبنە پردی گەیاندن لەنێوان ئەو زانیارییانە و دایکاندا. دایکانیش لەلایەن خۆیانەوە بەگوێرەی پێویستی و دروستبوونی پرسیار لایان، دەتوانن سوود لەو زانیارییانە وەربگرن. دایکی هۆشیار دایکێکە دەزانێت کە چ شتێك نازانێت و بەردەوام پێداویستییە مەعریفییەکانی پڕ دەکاتەوە. لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاستی هۆشیاریشدا، کۆڵەکانی سەرشانی سووکتر دەبن.

دیوەکەی تری ئەمەش بریتییە لە ناهۆشیاری، واتە درکنەکردن بە پێداویستییەکان و بەدروست زانینی ئەو شتانەی هەڵەن. ئەو دایکەی بەبێ بوونی پاشخانێکی زانستی و تەنیا لە ڕێی ئەو شتانەی بیستوونی و خۆی پێی ڕاستە، خەریکی پەروەردەکردنی منداڵە، ئەگەری زۆرە بکەوێتە هەڵەوە. چونکە لە پەروەردەدا پێویستە هۆشمەندی و سۆزداری دەستلەملانی یەکتر بن. بەڵێ وایە، هەموو دایکێک منداڵی خۆی خۆش دەوێت، بەڵام ئەگەر ئەم خۆشەویستییە بە شێوازی زانستی پاڵپشت نەکرێت، هیچ دوور نییە بە دەستی بەتاڵ بێینەوە.

> دایکی هۆشیار دایکێکە دەزانێت کە چ شتێك نازانێت و بەردەوام پێداویستییە مەعریفییەکانی پڕ دەکاتەوە.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٣٠

## ١٨- ئایا دایك خودسەنتەرە؟

ئایـا دایـک توانیـویەتی خـۆی لەو ئاکـارە خودسـەنتەری و یاخیبوونـانە دابماڵێت، کە زادەی قۆناغی هەرزەکارین؟ ئایا باوەڕی بە خـۆی هێنـاوە، کە دەکرێت جگە لە خـۆی کەسـانێکی دیـکەش خـاوەن ڕێـز و بەهـا بـن؟ کە دەچێت بۆ بازاڕ، ئایا تاوەکو ئێستاش بەزۆری شت بۆ خۆی دەکرێـت، یـان هاوسەر و منداڵەکانی پێش خۆی دەخات؟ ئایا لەدەستی دێت، میوانـداریی هاوڕێکانی لەبەر خاتری کاتبەسەربردن لەگەڵ منداڵەکەیدا هەڵبوەشێنێتەوە؟ ئایا بەگوێرەی کێ ڕێساکانی ناو ماڵی داناوە؛ خـۆی یـان منـداڵەکانی؟ ئایـا بۆچوونی هاوسەر و منداڵەکانی وەردەگرێت لەو بڕیارانەی دەیاندات؟

کـامڵبوونی دایـک پەیوەنـدییەکی بەهێـزی هەیە بە خۆدامـاڵین لە هەسـتی (منێتی). چونکە دایکایەتی وا لە مـرۆڤ دەکـات لە بـازنەی (مـن) بێـتە دەرەوە و بچێـتە نـاو بـازنەی (مـن و ئەوانـی تـر)ەوە. ئیدی مەگەر ئەوکـات بگـاتە ئەو ئاسـتەی کە منـداڵەکەی وەک هۆکارێـک نەبینێـت کە پانتایی ئازادییەکانی لێ تەسـک کـردووەتەوە و بووەتە ئاستەنگ لەبەردەمیدا.

> **دایکایەتی وا لە مرۆڤ دەکات لە بازنەی (من) بێتە دەرەوە و بچێتە ناو بازنەی (من و ئەوانی تر)ەوە.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٣٠

## ١٩- ئایا ژیانی سۆزداریی دایك ئاساییە؟

ژیـانی سـۆزداریی نێـوان هاوسـەران سروشـتیترین و دیـارترین هـێمای خۆشەویستی و گونجانیانە. تێکچوونی ژیانی سـۆزداری، بـاری دەروونیـی دایـک دەخـاتە ژێـر فشـارەوە. ئەم پەیوەنـدییە -کە هەر وەک خـواردن و

خواردنەوە پێداویستییەکی سروشتیی ئادەمیزادە- بە یەکێک لە بناغەکانی خێزانێکی تەندروست دادەنرێت. بۆیە پێویستە هاوسەران لەبەر خۆیان و ئایندەی لانەکەیان، بەگرنگییەوە بۆ ئەم مەسەلەیە بڕوانن. خۆ ئەگەر جارجار ساردبوونەوەیەکیش ڕووی دا، دەبێت نەهێڵن ببێتە حاڵەتێکی بەردەوام لەنێوانیاندا.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٤٠

## ٢٠- ئایا دایك توانای لێتێگەیشتنی هەیە؟

لێتێگەیشتن، هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە هەست و بیرکردنەوەی کەسی بەرامبەر. هەرچی هاوسۆزییە، خۆ خستنە شوێن کەسی بەرامبەر و هەستکردنە بەوەی کە ئەو هەستی پێ دەکات. ئەم هەستە لە دایکاندا لە لوتکەدایە. منداڵەکانیان بیر لە چی بکەنەوە و هەست بە هەر چییەک بکەن -با دووریش بن لێیانەوە- دەیزانن و هەستی پێ دەکەن. دایک لە هەموو کەس زیاتر هەست بە منداڵەکەی دەکات، باوکیش لە هەموو کەس زیاتر لێی تێدەگات. باوکان ئەگەرچی بە باشترین شێوە لە منداڵەکانیشیان تێبگەن، بەڵام هێشتا ناتوانن بە وێنەی دایکان لە ڕۆحیاندا وەک خۆی هەستیان پێ بکەن. بەڵام -بەداخەوە- دایک سەرکەوتوو نابێت لەوەی هەموو کات ئەم بەهرە سروشتییە لە خۆیدا بپارێزێت. هەندێك جار بە هۆی ئەزموونەکانی ڕابردوو، هەندێك جاری تریش بە هۆی گرفتەکانی ژیانی هاوسەرییەوە، ئەم هەستەی بەرەو کوێربوونەوە دەچێت. لەگەڵ لاوازبوونی ئەم بەهرەیەشدا، وردە وردە توانای دایکایەتیی کەم دەبێتەوە. هەر کە دایک هەستی بە کزبوونی ئەم لایەنە کرد لەنێوان خۆی و منداڵەکەیدا، پێویستە

دەستبەجێ پەیوەندییەکی قووڵ و درێژخایەن لەگەڵ منداڵەکەیدا دروست بکات.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٥٠

**دایک لە هەموو کەس زیاتر هەست بە منداڵەکەی دەکات، باوکیش لە هەموو کەس زیاتر لێی تێدەگات.**

## ٢١- ئایا تێرخەو دەبێت؟

لە مەرجە سەرەکییەکانی مامەڵەیەکی پەروەردەییانەی دایک لەگەڵ منداڵەکەیدا، ئەوەیە کە وەک پێویست بواری پشوودانی هەبێت. ئەو دایکەی بە چوستوچالاکی و زیندەیی ڕۆژ دەکاتەوە، دەتوانێت هەڵوێستی دروست لەهەمبەر گرفتەکاندا بنوێنێت و ڕێگەچارەی لەباریان بۆ بدۆزێتەوە. بۆیە لە ڕووی پەروەردەییەوە ئیسراحەتی دایک لەوپەڕی گرنگیدایە، بەڵام جاری وایە منداڵ ئەم دەرفەتە نادات بە دایکی. بەخەبەرهاتنەوەی چەندجارەی منداڵان لە شەودا و هەڵساندنی منداڵانی تەمەن ٢ ساڵ بۆ تەوالێت و ترسی شەوانەی منداڵانی تەمەن ٦ ساڵان، زۆر جار وا دەکات دایکان نەتوانن تێرخەو ببن. ڕەنگە هیچ کام لەوانەش لەئارادا نەبێت و دایک هەر خۆی تا درەنگانێکی شەو نەخەوێت. بەڵام دەبێت بزانرێت ئەو دایکەی لەژێر فشاری دەروونیی کەمخەویدا ڕۆژەکەی دەگوزەرێنێت، ناتوانێت بڕیاری دروست بدات و ڕەفتاری لەبار بنوێنێت. تێرخەویی دایک تەنها لەبەر پشووی جەستەیی نییە، بەڵکو لە ڕوانگەی پشووی زیهنیشەوە زۆر گرنگە. کاتێك تەماشای هەوڵ و ماندووبوونی ڕۆژانەی دایکان دەکەین، دەبینین لە ڕووی جەستەیی و ڕۆحیشەوە ماندوو دەبن؛ وەڵامدانەوەی پرسیارە دوانەهاتووەکانی منداڵ،

ئەنجامدانی کاروباری ڕۆژانەی ناوماڵ، میواندراری و کێشە خێزانییەکان، هەموو ئەمانە جەستە و ڕۆحی دایکان ماندوو دەکەن. لەبەر ئەوە پێویستە دایکان ئاگاداری کاتی خەویان بن، تەنانەت ئەگەر پێویست بکات دەبێت هاوسەرەکانیشیان یارمەتیدەریان بن، چونکە پەروەردەی منداڵ بەتەنها ئەرکی دایکان نییە. ئەگەر باری دەروونیی دایک باش نەبێت، لە تەواوی خێزاندا ڕەنگ دەداتەوە و گرفتی دیکەی لێ دەکەوێتەوە. بۆیە پێویستە باوکان بێ دوودڵی دەستی هاوکاری بۆ هاوسەرەکانیان درێژ بکەن و هەردەم لەپەنایاندا بن. بۆ نموونە؛ دەتوانن شەوان بیکەن بە نۆرە و هەر جارە و یەکێکیان ئاگاداری منداڵەکە بێت و زەمینە بۆ ئەوی تریان خۆش بکات تێرخەو بێت.

**ئەو دایکەی بە چوستوچالاکی و زیندەیی ڕۆژ دەکاتەوە، دەتوانێت هەڵوێستی دروست لەهەمبەر گرفتەکاندا بنوێنێت و ڕێگەچارەی لەباریان بۆ بدۆزێتەوە.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٥٠

## ٢٢- ئایا سیستمی خۆراکیی هاوسەنگە؟

لەوانەیە ئەمە وەک شتێکی ئاسایی بێتە بەر چاو، بەڵام لە ڕاستیدا سیستمی خۆراکیی دایک زۆر گرنگە. دایکان بە پاڵنەری سۆزی دایکانە، هەتا منداڵەکانیان تێر نەبن هەست ناکەن خۆیان تێر بوون. بەڵام ئێمە دەزانین ئەگەر بزوێنەری شەمەندەفەر سووتەمەنی لێ ببڕێت، مەحاڵە بتوانێت فارگۆنەکان ڕابکێشێت. لەبەر ئەوە، وا پێویست دەکات دایکان

هێنـدەی منـداڵەکانیان بـایەخ بە خواردنیـان بـدەن. بەدڵنیـاییەوە دەروونـی دایکێک کە بەبرسێتی ڕۆژی کردووەتەوە و ژەمەکـانی بەڕێکـی نەخـواردووە، وەک هی ئەو دایکە نییە کە لاشەی بڕە خۆراکی پێویستی وەرگرتووە.

لە لایەکی ترەوە، زۆرێک لە دایکان بە هۆی زیادبوونی کێشیانەوە -جا لە ماوەی دووگیانیدا بووبێت یان لە قۆناغەکانی دواتردا- دەست دەدەنە ڕێجیم، بۆ ئەو مەبەستەش پەنا دەبەنە بەر خۆبرسیکردن. لە کاتێکـدا جەسـتە دەبێـت ڕۆژانە ئەو بڕە وزەیە وەربگرێت کە پێویستی پێیەتـی، ئەگینـا کاردانەوەکـانی جەستە بۆ برسێتی، دایکەکە شپرزە دەکەن و بارگرژیی دەروونی بۆ دەسازێنن.

لە بەرامبەردا، خواردنی بێ بەرنـامە و کێشـی زیـادەش دیسـانەوە دەبێـتە هۆکاری بارگرانی بۆ دایک. ئاخر کێشی زۆر فشـار دەخـاتە سـەر جەسـتە و جووڵە سنووردار دەکات. لەولاشـەوە منـداڵ پـارچەیەک وزەیە، ئیـتر دایـک چـۆن بەو حـاڵەوە فریـای منـداڵەکەی دەکەوێـت. بە تێپەڕبـوونی کـات، جـووڵەی بەردەوامـی منـداڵ دەبێـتە هـۆی شـەکەتبوونی دایـک. باشـترین ڕێـگەش بـۆ وەسـتاندنی ئەو بـوونەوەرە پـڕ وزە و بـزاوتە، بەکارهێنـانی توندوتیژییە. وەک دەزانن توندوتیژیش هەوێنی توندوتیژییە.

لەبەر ئەوە ڕێکخسـتنی کاتەکـانی نـانخواردن و گرنگیـدانی دایـک بە ژەمەخۆراکەکـانی، ڕۆڵێکـی کـاریگەری دەبێـت لەسـەر پەروەردەی ڕۆڵەکانمان.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٢٠

## ٢٣- ئایا کاتەکانی ڕێك خستووە؟

ئەو دایکەی بەبێ بوونی پلانی ڕۆژانە هەنگاو دەنێتە ڕۆژێکی نوێوە و خۆی داوەتە دەست ڕەوتی پێشهاتەکان ئامانجی ئەو ڕۆژەی بۆ دیاری بکەن، یان لەناو بێسەروبەریدایە، یان ئەوەتا بەرەو شپرزەیی هەنگاو دەنێت. دەبێت دایک بزانێت چ ڕۆژێکی تەرخان کردووە بۆ یاری و چ ڕۆژێکیش بۆ چیرۆک و سەردانی پارک، تاکو سروشت بە جگەرگۆشەکەی بناسێنێت. هەروەها دەبێت چوونە دیدەنی و میوانداری، بەگوێرەی قۆناغەکانی گەشەی منداڵ ڕێک بخرێت. بۆ نموونە؛ ئەگەر کاتی خەوتنی کۆرپەی تازەلەدایکبوو بەهەند وەرنەگریت و تا درەنگانێک لە میوانی بمێنیتەوە و لەپای فەرامۆشکردنی منداڵەکان سەردانی خێزانی ئەنجام بدەیت، مانای وایە ڕەچاوی ئەو ئەرکە ناکەیت کە لە ئاکامدا دەکەوێتە سەرشانی دایک. هاوشانی ئەمانە، ئەگەر بگونجێت دایک بە چەشنێک بەرنامەڕێژیی ڕۆژەکەی بکات، فریای ئەوە بکەوێت ڕۆژی (٤٥) خولەک یان کاتژمێرێک خەوی نیوەڕوانە بکات، چونکە پێویستی بەوەیە لە ڕۆژەکەدا وزە بەدەست بهێنێتەوە. لە زۆرێک لە وڵاتانی ڕۆژئاوا سیمیناری تایبەتی دەبەسترێت سەبارەت بە پلانی ڕۆژانە و دانانی کارنامە.

ژیانی هەڕەمەکی و ئیشوکاری بێبەرنامە، ناهێڵێت دایکان بە ئارەزووی خۆیان دایکایەتی بکەن. لەبەر ئەوە لە سەروبەندی خۆناسیندا، پێویستە دایکان ئاگایان لەم لایەنە گرنگەش بێت.

> **دەبێت دایک بزانێت چ ڕۆژێکی تەرخان کردووە بۆ یاری و چ ڕۆژێکیش بۆ چیرۆک و سەردانی پارک.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٢٠

## ٢٤- ئایا دایك كارا و چالاكە؟

زۆرێـک لە دایکـان لەژێـر پەسـتانی ئیشـوکاری ڕۆژانەدا پلیشـاونەتەوە، ئاگایــان لە خۆشــیان نیــیە کە ئەوانــیش بــوونەتە مــایەی پلیشــانەوە و ســەرکوتکردنی منــداڵەکانیان. کۆتـا جووڵەکـانی ئەو بـووکەڵەیە چـۆنە کە خەریـکە پـیلەکەی لەکـار دەکەوێـت، ئەو دایـکەش کە وزەی پـێ نەمـاوە بە هەمان شێوە دەیەوێـت منـداڵەکەی دابنیشـێنێت. ئەگەرچـی ئەویـش مـافی خۆیەتی پشوو بدات، بەڵام ئەوەی لەو نێوەندەدا دەبێتە قوربانی، منداڵە.

ئەو دایکەی هەست بە شـەکەتی و نەمـانی وزە دەکـات، یەکەم شـت کە پێـی هەسـتێت ئەوەیە ڕیتمـی ڕۆژانەی بپێوێـت. بەو جـۆرە دەتوانێـت -بە نزیکی- ئەو وەختە دیاری بکات، کە تیایدا ماندوو دەبێـت. ئەو دایـکەی تـا (١٠)ی شـەو خـۆی پـێ دەگیرێـت، وا باشـە لەو کـاتە بەدواوە دەسـت لە هەموو شتێک هەڵبگرێت، چونکە خۆیشی و منداڵەکەشی مانـدوو دەکـات. هەر لەبەر ئەمە ڕێنمایی دایکان دەکەیـن چاوێـک بە ئیشـوکاری ڕۆژانەیانـدا بخشێننەوە، لە چ ڕۆژ و کاتێکدا جموجوڵی زیـادی دەکـرد، بـا لەو کاتـانەدا کەمتر وزە بەکار بەرێت.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٣٠

## ٢٥- تا چەند جووڵەی وەك پێویستە؟

ئافرەتی خاوەن منداڵ لە قۆناغێکی دیاریکراودا بیەوێت یـان نـا، ناچـارە خـۆی بخـزێنێتە مـاڵەوە. خۆشـتان دەزانـن جـووڵەی نـاو مـاڵ تـا بڵێـی سنووردارە. لە ئاکامی ئەمەشدا، توانا جەستەییەکانی دایک ڕوو لە لاوازبـوون دەکات. نەک هەر ئەوەندە، بگرە ئەمە ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ پەککەوتنـی هـزر و

دەروونیش. بۆیە دەبینیت جیاوازییەکی بەرچاو هەیە لەنێوان باری دەروونیی ئەو دایکەی کە بەڕێکوپێکی ڕاهێنانی وەرزشی ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەو دایکەی کە جەستەی ناخاتە جووڵە. لێرەدا مەبەستمان لە ڕاهێنانی وەرزشی، مەشق و ڕاهێنانی قورس و درێژخایەن نییە، بەڵکو مەبەستمان لەو جووڵانەیە کە بەئاسانی ئەنجام دەدرێن. لەوانە: پیاسەی ڕۆژانە بە درێژایی چەند کیلۆمەترێک، پیاسەی ناو ماڵ یان بەکارهێنانی پایسکیلی وەرزشی، کە بێگومان سوودی فیزیکی و ڕۆحیی گەورەیان لێوە بەدەست دێت.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٢٠

## ٢٦- ئایا نیازی خوێندنی هەیە؟

لە دەستپێکی زۆرێک لە سیمینارەکانمدا، هاوکارانم هەڵدەستن بە دابەشکردنی کاغەزی بچووکی تێبینی بەسەر دایکاندا. کاغەزەکان ڕێک و تازەن و هیچ جۆرە نووشتانەوەیەکیان پێوە نییە. پاشان ئامادەبووان ئاگادار دەکرێنەوە: "تکایە تا کۆتایی سیمینارەکە کاغەزەکانی دەستتان وەک خۆی بپارێزن، بێ نووشتاندنەوە و لۆچکردن." لە کۆتایی هەر سیمینارێکیشدا، هەڵدەستین بە کۆکردنەوەی کاغەزەکان. ئەوەی جێی سەرنجە، هەموو جارێک کاغەزەکان یان نووشتێنراونەتەوە، یان سووچەکانی دڕێنراوە و پێچراونەتەوە. بەکورتی، هیچیان گوێیان بە ئاگادارییەکەمان نەداوە. ئەوجا ئێمەش دەکەوینە ڕوونکردنەوەی ئامانجی کارەکەمان:

"ئەو کاغەزە پاک و سافانەی سەرەتا دابەشمان کرد، هێمایە بۆ منداڵەکانتان. کاتێک دەبنە میوانمان، بە وێنەی ئەو کاغەزانە پاک و ساف و بێخەوشن، هیچیان لەسەر نەنووسراوە."

جـا لەبەر ئەوەی بـاس و خواسـی نـاو سـیمینارەکە سـەرنجی دایکـانی ڕاکێشابوو، بێ ئەوەی ئاگایـان لە خۆیـان بێـت، کەوتبـوونە سـەروگوێلاکی پارچە کاغەزی داماو و چرچولۆچیان کردبوو.

ڕێک وەک ئەو نموونەیە، ئەگەر دایک سەرنجی خۆی لەسـەر بـابەتێکی دیکە چڕ کردبێتەوە، هـیچ دوور نیـیە بـابەتە سـەرەکییەکەی -کە پێگەیانـدنی منداڵەکانیەتی- فەرامۆش بکات. ئەو دایکەی نیازی خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامەی هەیە، ڕەنگە لەتاو چڕبوونەوەی لەو لایەنەدا، کاتی ئەوەی نەبێـت بەدەم داواکاریی منداڵەکانیەوە بچێت.

بەدەر لەمە، زۆر گرنگە پلانەکان واقعی بن، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە بەردەوام بەدوای بیانوویەکدا دەگەڕێت بۆ شکستەکانی. بەداخەوە، زۆرێک لە دایکان لە بابەتی خوێندندا منداڵەکانیان بە هۆکارێکی نەرێنی دادەنێن و پێیان وایە ڕێگرن لەبەردەم بەدیهێنانی خەونە ئەکادیمییەکانیاندا.

لەم جۆرە حاڵەتانەدا ئەگەری ئەوە لەئـارادایە، دایـک هەنگـاو هەنگـاو لە منداڵەکەی دوور بکەوێتەوە و لەژێر کاریگەریی ئەو بارە دەروونییەدا هەسـت بە جۆرێک لە تووڕەیی بکات بەرامبەر منـداڵەکەی. بـۆیە لێـرەوە دەڵێـین ئەو دایکانەی پلانی بەردەوامییان هەیە لە بوارە ئەکادیمییەکانـدا، وا پەسـەندە ئەو خاڵانەی سەرەوە لەبەرچاو بگرن.

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٤٠

## ٢٧- ئایا گرفتی تەندروستیی هەیە؟

کاتێک دەوترێت گرفتی تەندروستی، تەنها مەبەستمان لەدەستدانی یەکێک لە ئەنـدامەکان نیـیە، بەڵکـو ئەو دایکـانەش کە سەرئێشـەی درێژخـایەن و تەنـگە

نەفەسییان هەیە، یان بە هۆی کەمخوێنی و کێشی زۆرەوە زوو ماندوو دەبن، هەمان ناونیشانیان بەسەردا دەچەسپێت. نەخۆشی و ئازارە جەستەییەکان دەبنە ڕێگر لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان و هەوەسی ژیان لە ناخی دایکدا کەم دەکەنەوە.

بەڵێ: ٣٠

نەخێر: سفر

## ٢٨- ئایا باری گوزەرانی لەبارە؟

دنیای مۆدێرن، کۆمەڵگەی هاریکاریی لەناو برد و لە جێگەیدا کۆمەڵگەی کێبەرکێی دانا. لەناو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە فەلسەفەی ژیانی هەرەوەزی باڵادەست بوو، خراپی باری ئابووری ئەو کاریگەرییە نەرێنییەی نەبوو بەسەر خێزانەکانەوە. کەچی لە کۆمەڵگە تاکخوازەکاندا، کێشەی ئابووری ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی هەیە بەسەر ژیانی خێزانەکانەوە. جێی داخە، دنیای مۆدێرن بنەمای هاوکاریی کۆمەڵایەتی بۆ نزمترین ئاست دابەزاندووە. خێزانەکان ناچارن بەتەنها شان بدەنە بەر کۆڵی سەختی گوزەران. بیرم دێ جارێکیان دایکێک ئەمەی خوارەوەی بۆ گێڕامەوە:

"خەرجیی بێبەرنامەمان وای کرد، دوچاری قەیرانی ئابووری ببین. هەر ڕۆژە و ئاگادارییەکمان بۆ دەهات سەبارەت بە تێپەڕبوونی وادەی قەرز و قیستەکانمان. ماڵمان ببوو بە گۆڕستان. من لەدەست نابەرپرسیارێتیی مێردەکەم وەڕس ببووم، ئەویش سکاڵای ئەوەی دەکرد کە من کار ناکەم. دوا جار بڕیارم دا کارێك بۆ خۆم بدۆزمەوە. نەمدەزانی ئەم بڕیارە کتوپڕە چەندین گرفتی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێت، چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو خۆم لەناو بێنەویردەی کاردا ببینمەوە. ئیدی نەمدەتوانی وەک پێویست لەگەڵ منداڵەکەمدا کات بەسەر ببەم، لەتاو ماندوێتیش دەستم لە ئیشوکاری ناو ماڵ

شتبوو. لە هەمووشی ناخۆشتر، ساردی کەوتبووە نێوان من و مێردەکەمەوە. ڕاستە گرفتی ئابووریمان نەما، بەڵام لەگەڵ مێردەکەمدا کێشەی سۆزداریم بۆ دروست بوو. ئەم جارە مشتومڕەکانمان لەسەر پارە نەبوو، بەڵکو لەسەر گرنگینەدان بوو بە یەکتری. لەو نێوەندەشدا هەستمان بە شتێک کرد، بەتەواوەتی منداڵەکەمان فەرامۆش کردبوو."

بەڵێ وایە، گرفتی ئابووری چەندین گرفتی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

ئەگەر دایکیش بەشدار بوو لە هەڵگرتنی کۆڵی قورسی ئابووریی خێزان، ئەوکات پێویستە ئاگادار بێت ئەم گرفتە نەبێتە سەرچاوەی کێشە و گرفتی دیکە. ڕازیبوون بە کەم، زۆر لەوە باشترە خۆشەویستی و پەیوەندیی خێزان بپچڕێت.

**ڕازیبوون بە کەم، زۆر لەوە باشترە خۆشەویستی و پەیوەندیی خێزان بپچڕێت.**

بەڵێ: سفر

نەخێر: ٣٠

| ئەو قورساییانەی لە سەرشانی دایکە | بەڵێ | نەخێر | نمرە |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ .ئایا دایک حەز و چێژی ژیانی هەیە؟ | سفر | ٥٠ | |
| ٢ .ئایا پایەی دایکایەتی بەخشراوە بە دایکەکە؟ | سفر | ٦٠ | |
| ٣ .ئایا دایک سەربەستە لەوەی چۆن منداڵەکەی پەروەردە بکات؟ | سفر | ٤٠ | |
| ٤ .ئایا دایک چوار ساڵی یەکەمی تەمەنی لە دایکی خۆی دوور بووە؟ | ٥٠ | سفر | |
| ٥ .ئایا دایک بڕوای هەیە؟ | سفر | ٨٠ | |
| ٦ .ئایا دایک پەروەردەی خێزانێکی توندوتیژە؟ | ٤٠ | سفر | |
| ٧ .ئایا لە ڕابردوودا ئەو دایکە تووشی گێچەڵی سێکسی بووەتەوە؟ | ٩٠<br>١٩٠<br>٢٤٠ | سفر | |
| ٨ .ئایا هاوکاریی پێویست لە خێزانەکەیەوە وەردەگرێت؟ | سفر | ٣٠ | |

| ٩ .ئايا بە ویستی خۆی بووە بە دایک؟ | سفر | ٢٠ | |
|---|---|---|---|
| ١٠ .ئايا لە دڵەوە منداڵەکەی قبوڵ کردووە؟ | سفر | ٤٠ | |
| ١١ .ئايا هاوسەرەکەی خۆش دەوێت؟ | سفر | ٧٠ | |
| ١٢ .ئايا لەلایەن مێردەکەیەوە خۆش ویستراوە؟ | سفر | ٤٠ | |
| ١٣ .تا چ ئاستێک دایک ئالوودەی ئامێرە تەکنەلۆژییەکانە؟ | ٤٠ | سفر | |
| ١٤ .ئایا دایک جگەرە و مادده کحولی و هۆشبەرەکان بەکار دەهێنێت؟ | ٩٠<br>٢٠ | سفر | |
| ١٥ .ئایا وەک پێویست ئەزموونی کۆمەڵایەتیی هەیە؟ | سفر | ٢٠ | |
| ١٦ .ئایا دایک بەهەڵپە و تووڕەیە؟ | ٣٠ | سفر | |
| ١٧ .ئایا دایک پەروەرشیارێکی هۆشیارە؟ | سفر | ٣٠ | |
| ١٨ .ئایا دایک خودسەنتەرە؟ | سفر | ٣٠ | |
| ١٩ .ئایا ژیانی سۆزداریی دایک ئاساییە؟ | سفر | ٤٠ | |

| ٢٠ .ئایا دایک توانای لێتێگەیشتنی هەیە؟ | سفر | ٥٠ | |
|---|---|---|---|
| ٢١ .ئایا تێرخەو دەبێت؟ | سفر | ٥٠ | |
| ٢٢ .ئایا ڕژێمیی خۆراکی هاوسەنگە؟ | سفر | ٢٠ | |
| ٢٣ .ئایا کاتەکانی ڕێک خستووە؟ | سفر | ٢٠ | |
| ٢٤ .ئایا دایک کارا و چالاکە؟ | سفر | ٣٠ | |
| ٢٥ .تا چەند جوولەی وەک پێویستە؟ | سفر | ٢٠ | |
| ٢٦ .نیازی خوێندنی هەیە؟ | سفر | ٤٠ | |
| ٢٧ .ئایا گرفتی تەندروستیی هەیە؟ | ٣٠ | سفر | |
| ٢٨ .باری گوزەرانی لەبارە؟ | سفر | ٣٠ | |
| **کۆی گشتی** | | | |

## چۆن وەڵامەکان هەڵبسەنگێنین؟

سەرەتا هەستە بە کۆکردنەوەی وەڵامەکانت، بەبێ جیاوازی لەنێوان وەڵامە (بەڵێ) و (نەخێر)ەکاندا، ئەوجا ژمارەکە دابەش بکە بەسەر (١٠٠)دا. ئەو ئەنجامەی بۆت دەردەچێت، بریتییە لە بڕی ئەو قورساییەی لە سەرشانی دایکە. بە دەربڕینێکی تر؛ ئەو دایکە بە ئەندازەی ئەو قورساییە دەتوانێت دایکایەتی بکات. هۆکاری زۆرێک لەو هاتوهاوار و مامەڵە زبرەی بەشێک لە دایکان بەرامبەر ڕۆڵەکانیان دەینوێنن، دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی خراپی ئەو کۆڵە قورسانە و شوێنکەوتە نەرێنییەکانی لەسەر ئەقڵی نائاگای ئەو دایکە.

لەم ڕووەوە، هەڵسەنگاندنی ئەنجامەکان بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەبێت:

### (٩) پلە یان زیاتر: قەیران

ئەگەر پاش دابەشکردنی ئەنجامی تێکڕای وەڵامەکانت بەسەر (١٠٠)دا، ژمارە (٩) یان زیاترت بۆ دەردەچوو، مانای وایە قورساییەکانی سەرشانت هێندە زۆرن کە ڕەنگە جاروبار تووشی گرفتی ڕاستەقینەت بکەن. ئەو دایکە بەڕێزەی کە ئەو هەموو کۆڵ و قورساییەی هەڵگرتووە، هەر چەندێکیش ئارام و بەهێز بێت، هێشتا بەرگەی هەڵگرتنی ئەو هەموو بارە ناگرێت، ئەگەری دارمانی لەژێر ئەو فشارەدا مەسەلەی ئانوساتە. دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کە ئەم کۆڵە دەروونییانە دەبنە مایەی چەندین جۆر دەرد و نەخۆشیی جەستەییش. لە دیارترین نیشانەکانی ئەم حاڵەتە: سووڕهەڵگەڕان و شینبوونەوەی هەندێک شوێن، هەڵچوونی نائاسایی، گریانی بێ هۆ، سەرێشە، لەگەڵ ئازاری گەدە بەرامبەر بچووکترین کێشە. ئەو دایکەی کە (٩)

پلە قورسایی لە سەرشانە، هەرچییەکی کردووە دەبێت هاوکاریی دەروونی وەربگرێت، ئەگینا منداڵ و هاوسەرەکەی گیر دەخۆن بەدەستیەوە. دایک وەک سەقفی خێزان وایە، خوانەخواستە ئەگەر بڕووخێت، یەکەم کەس خێزانەکەی تیادەچێت.

## (٧-٨) پلە: قۆناغی هەستیار

(٧-٨) مانای وایە ئەو دایکە لە قۆناغێکی زۆر هەستیاردایە. بە پشتبەستن بە بەهێزیی کەسێتییەکەی، چەندە هەوڵی ئەوە بدات خۆی وا دەرنەخات ئەو هەموو کۆڵەی لە سەرشانە، کەچی منداڵەکانی زۆر چاک دەزانن کە دایکیان خەریکە دەپلیشێتەوە.

ئەو دایکانەی ئەو هەموو کۆڵە نەرێنییانەیان هەڵگرتووە، منداڵەکانیان بەزۆری لەناو ترس و بێمتمانەییدا دەژین. بەگشتی ئەو جۆرە دایکانە بەوەدا دەناسرێنەوە، کە کاردانەوەی بێمانا و ناپێویست دەنوێنن بەرامبەر هەڵسوکەوتی منداڵەکانیان. منداڵەکەی داوای شتێکی زۆر سروشتی و ئاسایی دەکات، کەچی دایکەکە لەتاو بێئۆقرەیی و دڵەڕاوکێکانی ناو ناخی خۆی، کاردانەوەیەکی نائاسایی دەنوێنێت. لە ڕاستیدا خۆیشی لەم هەڵوێستەی بێزارە، بەڵام چی بکات، تازە کەوتووەتە ناو گێژاوێکی بێ دەرچەوە. هۆکاری ڕەتکردنەوەی داواکارییە سروشتی و ئاساییەکانی ئەو منداڵە لەلایەن دایکیەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارگرانییە دەروونییانەی کە لەسەر ئەقڵی نائاگای دایکەکەیە.

لە لایەکی ترەوە، دایکەکە لەژێر کاریگەریی ئەو دڵەڕاوکێ و قەلەقە دەروونییەی کە لە نەستیدا دەگوزەرێ و زۆر جار هەوڵدەدا لە خۆیشی بشارێتەوە، پەیوەندییەکی ناتەندروست لەگەڵ منداڵەکەیدا دروست دەکات.

لەبەرچـاوترین نموونەکـانی ئەم حـاڵەتە: ترسـی ئەوەی هەر سـاتێک شـتێک بقەومێت، گومـانکردن، متمانەنەمـانی کتـوپڕ، کـاردانەوەی سـۆزداریی زیـاد لە پێویسـت، بڕیـاردان بـێ ئەوەی بیـری لـێ بکـاتەوە، پەشـیمانیی لەڕادەبەدەر، خۆتاوانبـارکردن و لەخۆخوێنـدن. ڕوونە، کە دایکێکـی لەو جـۆرە ناتوانێـت بەهاوسەنگی ئەرکەکانی لەنـاو خێزانـدا بەڕێ بکـات. بۆیە چ لەپێنـاو پەروەردەی دروسـتی منداڵەکەیـدا بێـت، یـان سـووککردنی بارەکـانی کـۆڵی خۆی، پێویسـتی بە هاوکـاریی کەسانی پسپۆڕە، چونکە خۆی بەتەنیـا ناتوانێـت لە ڕووی ئەو هەموو کێشـەیەدا بوەسـتێتەوە. ئەگەر کۆئەنـدامە دەمـارێکی تۆکمەی هەبێت، ڕەنگە تـا مـاوەیەک بتوانێـت بەرگە بگرێـت، بەڵام خـۆ هەر وا ئاسان نییە تەمەنێک بەو هەموو کۆڵ و بـارەوە ئەرکـی دایکـایەتی و هاوسـەرێتی بەجێ بگەیەنێت!

**کۆڵە دەروونییەکان دەبنە مایەی سەرهەڵدانی چەندین جۆری دەرد و نەخۆشیی جەستەیی. لە دیارترین نیشانەکانی ئەم حاڵەتە: سوورهەڵگەڕان و شینبوونەوەی هەندێک شوێن، هەڵچوونی نائاسایی، گریانی بێ هۆ، سەرێشە، لەگەڵ ئازاری گەدە.**

### (٥-٦) پلە: کێشەیە

لە حاڵێکـدا ئەگەر ئەنجـامەکە (٥-٦) دەربچێـت، ئەوە دەگەیەنێـت کە قورسـاییەکانی سەرشـانی ئەو دایـکە گەیشـتووەتە ئاسـتێک کە دەتـوانین بە (قۆناغی کێشـە) نـاوی بەریـن. ئەم جـۆرە دایـکە لە ڕێـگەی خـاڵە بەهێزەکـانی کەسـێتییەکەیەوە، ناهێڵێـت دەوروبەرەکەی هەسـت بە کێشـەکانی بـکەن، بەڵام

پرسیارەکە ئەوەیە: تا چەند دەتوانێت دایکایەتییەکی سەرکەوتوو ئەنجام بدات؟ پێم وایە ناحەقییە چاوەڕێی سەرکەوتنی لێ بکەین لە پێگەیاندنی منداڵەکانیدا.

تایبەتمەندیی ئەم جۆرە دایکانە ئەوەیە، بەردەوام لەنێو هەڵبەز و دابەز و ئاڵوگۆڕیی دەروونیدان. لەبەرامبەر کێشەکاندا، جاری وایە ئەوپەڕی پڕ وزە و خۆڕاگرن، کەچی جاری وایشە لە بێچارەییدا گەوزاون. هەندێك جار سۆزدارن، هەندێك جاری تریش مەنتیقی و ئەقڵدۆست. ئەگەر دۆخەکە لەبار بێت، کۆڵە (٥-٦) پلەکەی سەرشانیان ناکەن بە کێشە و گوێی نادەنێ. بەڵام هەر ئەوەندەی خۆیان لەبەردەم کێشەیەکدا بینیەوە، ئیدی دەستەوسانی و لاوازیی باری دەروونیان بەجارێ قوت دەبێتەوە. ئەگەر خاوەن بەهای مەعنەوی و گڕوتینی ژیان بن و دەوروبەریش هاوکاریان بێت، بێ هیچ نارازیبوونێك لەسەر ژیانی خۆیان بەردەوام دەبن. بەڵام گرفتەکە لەوەدایە، ناتوانن لەگەڵ منداڵەکانیان هاوسەنگ بن، بۆیە ڕێنمایی ئەو دایکانە دەکەین جاروبار سەردانی کەسانی شارەزا بکەن.

## ٤ پلە: سەرەتای گرفت

بێگومان ئەو دایکەی هەستەکانی ئاسایی نییە، هەڵسوکەوتی لەگەڵ منداڵەکەیدا ئاسایی نابێت. منداڵی بەستەزمان شتێک دەکات، کەچی کاردانەوەی دایکی هەر جارە و جۆرێکە؛ جارێک دەمبەخەندە و نەرمە، جارێکیش ڕووگرژ و دەمبەهاوار. بەزۆریش پەنا دەبەنە بەر شێوازی سزادان و زیاد لە پێویست سنووردار و ڕێسادارێژن.

ئەو دایکانەی لەم ئاستەدان، پێشنیارمان بۆیان ئەوەیە چاودێریی وردی هۆکاری هەڵسوکەوتەکانی خۆیان (لەبەر چی لێرەدا بەو جۆرە جووڵامەوە؟) و ئەو بڕیارانەیان بکەن، کە لەبارەی پەروەردەی منداڵەکانیانەوە دەیدەن. چونکە

زیادەڕەویمان نەکـردووە ئەگەر بڵێـین زۆرێـک لەو هەڵسـوکەوت و بڕیـارانە، لە ئەنجامی کاریگەریی خراپ و ڕەنگدانەوەی نەرێنیـی قورسـاییەکانی سەرشـانی دایکەکەوە سەرچاوەیان گرتووە.

**ئەو دایکەی هەستەکانی ئاسایی نییە، هەڵسوکەوتیشی لەگەڵ منداڵەکەیدا ئاسایی نابێت. بەزۆری پەنا دەباتە بەر شێوازی سزادان و سنووردارکردن.**

هەروەها ڕێنمایی دەکەیـن بەوەی جارویار بۆچـوونی کەسـانی پسپۆڕ وەربگرێـت سـەبارەت بە شـێوازی مامەڵەی، چ بەرامبەر بە خـۆی، وە چ بەرامبەر ڕۆڵەکانی. لەوانەیە دایـکەکە خـۆی پێـی وا بێـت هـیچ گرفتێکـی نیـیە. لـێ کە لە چـاوی کەسـێکی شـارەزاوە دەڕوانـین، چاومـان بە چەندین شێوازی نائاسایی دەکەوێت لە هەڵسوکەوتەکانیدا.

## (٣-٢) پلە: وریابە، ڕەنگە هەروا نەمێنیتەوە

(٣) پلە لە قورسایی (کە بۆ تێگەیشتن دەڵێین ٣٠٠ کیلۆ) هـێمایە بـۆ ئەوەی، لە هەر ساتێکدا ئەگەری ئەوە لەئـارادایە هاوسـەنگییەکان تێک بچـن. بێگومـان ئەمە لە دایکێکەوە بۆ دایکێکی تـر و بەگـوێرەی توانـای بەرگەگرتنـی کەسـەکان دەگۆڕێـت. ئەو دایـکەی لەم قۆنـاغەدایە، زۆر گـرنگە بە بەرچـاوڕوونییەکی ئاگایـانە چـاودێریی دنیـای هەسـتەکانی بکـات و هەوڵ بـدات لە سـایەی ئەو تێبینیانەدا کە لەسەر خـۆی لای کەڵەکە بـووە، کۆششـی خۆچـاککردن بکـات. ئەمە جـگە لەوەی کە ئاسـتی هۆشـیاریی دایـک و سـوودوەرگرتن لە ئەزمـوونی پسپۆڕان، ڕێی بەردەمی کورتتر دەکەنەوە.

بەدەر لەوە، نابێـت دایـک پـاڵی لێبـداتەوە و پشـت بەو کەشـە خۆشـە ببەستێت کە ئێستا تیایدایە، بەڵکو دەبێ بەردەوام داوای یـارمەتی و کـۆمەکی لە هاوسەر و چواردەورەکەی بکات. هەروەهـا هەوڵ بـدات سـوود لە خـاڵە بەهێزەکانی وەربگرێـت -بەتـایبەت لایەنە ئەرێنییەکـانی (٢٨) پرسـیارەکەی سەرەوە- و بیانکات بە کانگای حەز و گڕوتینی ژیان بۆ خۆی.

### (١) پلە یان کەمتر

ئەو دایکانەی ئەنجامی وەڵامەکانیان یەک یان کەمترە، پێمان وایە گرفتێکی ئەوتۆیان نییە، یان هەر هیچ نەبێت لە ڕێگەی تایبەتمەندییە ئەرێنییەکانیـانەوە توانیویـانە هاوسـەنگیی خۆیـان بپـارێزن. بـۆ نمـوونە؛ ئەو دایـکەی پـایەی دایکایەتیی پێ ڕەوا نەبینراوە، دەتوانێت لە ڕێگەی خاڵە ئەرێنییەکـانی تـریەوە کاریگەریی نەرێنیی ئەم قورساییە بۆ کەمترین ئاست دابەزێنێت. دایکێک کە گڕوتین و حەزی ژیـانی هەیە، ئەوەنـدە نـاچێتە ژێـر بـاری ئەوەوە کە پـایەی دایکایەتی نەدراوەتێ. پێشنیاری ئێمە بۆ ئەو دایکانەی یەک یان کەمتریان بـۆ دەرچـووە ئەوەیە، بە وردییەکـی زیـاترەوە بەشـەکانی دواتـری ئەم کتێـبە بخـوێننەوە، چـونکە باوەڕمـان وایە لە مـاوەیەکی زۆر کەمـدا دەتـوانن بەرەوپێشچوونێکی بەرچاو تۆمار بکەن.

## سەرەتای سووڕانەوە لە بازنەی بەتاڵدا: هەڵگرتنی کۆڵێك کە لە توانای خۆت بەدەربێت

خوێنەری ئازیز، تاکو ئێرە باسمان لەو بەربەستانە کـرد کە دەبـنە ڕێگـر لەوەی دایکان هەستن بە ئەرکی دایکایەتی، ئەو بەربەستانەشمان بەو قورسـاییانە چوانـد کە لەسەر شانی دایـکەکەن. لێتـان ناشـارمەوە زۆرێـک لەو دایـکە بەڕێـزانەی وا

هەست دەکەن گرفتێکی ئەوتۆیان نییە، وەختێ خۆیـان بە تەرازووی خاڵەکـانی سەرەوە دەکێشن، ئەوجا دەزانن چ کۆڵگەلێکی شاراوەیان لەکۆڵی خۆیـان نـاوە. ڕەنـگە یەکێـک بپرسـێت: "باشــە، دایـک چ زیـانێکی پێـدەگات بەو کـۆڵانەی سەرشانی، یاخود چۆن ڕەنگ دەداتەوە لە هەڵسوکەوتەکانیدا؟"

پێش ئەوەی بچینە سەر وەڵامـی پرسـیارەکە، پـێم باشـــە ئامــاژەیەک بــۆ ئەو پەیوەنــدیی خۆبەخــاوەنزانینە بکەیــن کە لەنێــوان دایــک و منداڵـــدا هەیە. بـــۆچی؟ ئــاخر لە ڕوانـــگەی دایـکەوە، منـداڵ پـارچەیەکە لە خـۆی، بـۆیە وا دەزانێـت مـافی خـۆیەتی چـۆنی بوێـت ئاوەهـا مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

"خۆبەخاوەنزانینی منداڵ بەئاسانی دەگۆڕێت بۆ قۆستنەوەی"

لە ڕاستیدا کە لە ڕوانگەی دایکەوە تەماشای مەسەلەکە دەکەیـن، دەبینـین منداڵ وەك (بەشێك لە خۆی) دەبینێـت، ئەگەر شـتێک بەسـەر منداڵەکەیـدا بێت، وەک ئەوە وایە بەسەر خۆیدا هاتبێـت. ئەگەر شـتێکیش لە منـداڵەکەی بکات -بـا بە نـاڕەواش بێـت- یـان لێـی بـدات و زویریشـی بکـات، زۆر بە خەیاڵیدا نایەت، چونکە بەرامبەر بە پارچەیەک لە خۆی وای کـردووە! وەهـا بیر دەکاتەوە کە: "مەگەر وا نییە، هیچ دایکێکت بینیـوە بەئەنقەسـت ئـازاری منداڵەکەی بدات!".

جـا بــۆیە ئەگەر ئاگــاداری ئەم حــاڵەتە دەروونیـــیە، واتە پەیوەنـــدیی خۆبەخاوەنزانین نەبـین، لەوانەیە پـاش مـاوەیەک (قۆسـتنەوەی سـۆزداری) بەدوای خۆیدا بهێنێت. دوور نییە بڵێـت: "مەگەر مـن دایکـی نـیم؟ لێیشـی دەدەم و ماچیشی دەکەم". لە ڕاستیدا ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە چەندە نـاڕەوایە، ئەوەندەش نامرۆڤانەیە.

ئەو دایکانەی دەیانەوێت ڕۆڵەی خاوەن ڕێـز و شـکۆ پێبگەیەنن، نابێت لەسـەر بنەمـای قۆسـتنەوەی سـۆزداری مامەڵەیـان لەگەڵ بـکەن، چ جـای ئەوەی وەک ماڵ و موڵکی خۆیـان سـەیریان بـکەن. بەپـێچەوانەوە، هەر کە هەسـتیان کـرد بیرکردنەوەیەکـی لەو جۆرەیـان بـۆ دروسـت بـووە، پێویستە یەکسەر بەخۆیاندا بچـنەوە. بەڵام دەڵێـی چـی، تێگەیشـتنی دایـک لەوەی کە قۆستنەوەی سۆزداری منداڵەکەی دەکات -بەبێ ویستی خۆی- یـان ئـازادیی ئەوەی نییە چـۆن بیەوێـت بەو شـێوەیە مـامەڵەی لەگەڵـدا بکـات، کـارێکی هێنـدە ئاسـان نیـیە، مەگەر تەنهـا لە ڕێـگەی هاوکـاریی کەسـی پسـپۆڕەوە بتوانێت ئەو هۆشـیارییە لە خۆیـدا دروسـت بکـات. چـونکە زۆربەی جـار دایکان ئاگاداری بـارە قورسـەکانی سەرشـانیان نـین و نـازانن چـۆن کـاری کـردووەتە سـەر ڕەفتارەکانیـان و چ زیانێکیـان بە ڕۆحـی منـداڵەکانیان گەیاندووە.

بە دەربڕینێکی دیکە، بار و قورساییەکانی سەرشانی دایـک چەنـدە زۆر بـن، ئەوەندە ئەگەری زیاترە ئەو دایکە بەسەر منداڵەکەیدا بتەقێـتەوە. مەبەستیشـمان لە تەقیـنەوە، ئەو تونـدوتیژی و تـووڕەییەیە کە زۆر جـار دایکـان بـۆ هێورکردنەوە و خاڵیکردنەوەی خەشم و هەڵپەی دەروونیی خۆیـان بەکـاری دەهێنن.

بەم حاڵەتە دەڵێین بازنەی بەتـاڵی تونـدوتیژی. دۆخێکـی هێنـدە سـەیرە، هەر ئەوەندەی دەستی پێ کرد ئیدی کۆتـایی نیـیە، هەر کەسـێکیش بکەوێـتە ناوی، وا دەزانێت خـۆی لەسـەر حەقە. هەنـدێك جـاریش دەچێـتە پێسـتی مەڕەوە و دایکان دەخاتە ژێـر ڕکێفـی خـۆیەوە. وا دەهێنێـتە پـێش چاویـان، گوایا سزادان منداڵ بەرەو ڕاست و دروستی ئاڕاستە دەکات.

## ١- بازنەی بەتاڵی توندوتیژی

بارە قورسەکانی سەرشانی دایک وا لەو دایکە دەکات، لە ساتەوەختێکی چاوەڕواننەکراو و بە شێوەیەکی نائاسایی بە منداڵەکانی یان مێردەکەیدا بتەقێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا ڕەنگە ئەو دایکە خۆی لە بنەڕەتدا کەسێکی لەسەرخۆ و پڕ سۆز و ئەوینیش بێت. جگە لەوەی، زۆربەی جار خۆیشی نیگەرانە لەو هەڵچوونە دەروونییانەی دەیاننوێنێت.

دەبینێت بەرامبەر هەڵسوکەوتە ئاساییەکانی منداڵەکەی، کاردانەوەی نائاسایی دەنوێنێت، تومەز بەستەزمانە لەتاو کۆڵەکانی سەرشانی، توانای بەرگەگرتن و هێوربوونەوەی نەماوە. منداڵیش لەلایەن خۆیەوە بەرامبەر ئەو تووڕەیی و کاردانەوە ناپێویستانەی کە لە دایکیەوە دەیبینێت، پەنا دەباتە بەر چەندین خووی نائاسایی. ئەم جارە دایکەکە بە شێوەیەکی ڕەقتر بەرەنگاری دەبێتەوە.

تۆ تەماشای ئەم بازنەی کاردانەوەیە بکەن:

منداڵ بەردەوام هەست بە دڵەڕاوکێ و نائارامی دەکات، ئەگەر ببینێت دایکی توانای بەرگەگرتنی نەماوە.

دڵەڕاوکێ و نائارامی ڕێخۆشکەرە بۆ هەڵسوکەوتی نائاسایی.

لە بەرامبەر هەڵسوکەوتە نائاساییەکانی منداڵەکەیدا، دایک پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی هێز.

لەپێناو پاراستنی کەسێتیی خۆیدا، تا دێت منداڵەکە زیاتر پێداگری لەسەر هەڵسوکەوتەکانی دەکات.

وەک دەبینن، ئەمە ئەو بازنە بەتاڵەی توندوتیژییە کە زۆرێک لە دایکان گیریان خواردووە بەدەستیەوە. بێگومان ئەم حاڵەتە ئازاری ویژدان دەدات، بۆیە جاری وایە خۆیشیان سکاڵا دەکەن لە دەستی. دایکی ماندوو هەرچییەک

دەکات منداڵەکەی پێ ناخەوێنرێت، سوورە لەسەر ئەوەی نان نەخوات و گوێڕایەڵیی دایکی نەکات، ئەویش بەناچاری یەک دوو زلەی لێ دەدات، هەتا ئەوەی بەدەم گریانەوە خەوی لێدەکەوێت. ئەوجا کە دایکی دڵمیهرەبان ڕووخساری بۆ خەوشی جگەرگۆشەکەی دەبینێت

> دەبینیت بەرامبەر هەڵسوکەوتە ئاساییەکانی منداڵەکەی، کاردانەوەی نائاسایی دەنوێنێت، تومەز بەستەزمانە لەتاو کۆڵەکانی سەرشانی، توانای بەرگەگرتن و هێوربوونەوەی نەماوە

کە خەوتووە، خۆی پێناگیرێت و دەست دەکات بە گریان، خۆی بە خەتابار دەزانێت: "ئاخر بۆچی من بەو شێوەیە لەگەڵی دەجووڵێمەوە؟" خەمتان نەبێت ئەوە هەر شەو وایە، کە ڕۆژ دەبێتەوە هەمان بەزم دەست پێدەکاتەوە. دایکی بێتەحەموول، منداڵی هاروهاج، سەرەنجام هەوروهەڵای بەزم و توندوتیژی، ئاسمانی ناو خێزانی تەنیوە.

## ٢- ئاژەڵ بە سزا پەروەردە دەکرێت، مرۆڤیش بە ویژدان

زۆر جار دایکان ناچارن لە ئەقڵی نائاگای خۆیاندا، پاساوێکی ویژدانی بۆ ئەو توندوتیژییانە بدۆزنەوە کە بەرامبەر منداڵەکانیان پیادەی دەکەن. ئەگەر نا، هەستی خەتاباریی شەوانە و دووبارەکردنەوەی هەمان چیرۆکی ڕەقی و تووڕەیی لە ڕۆژدا، لە ڕووی سۆزدارییەوە تامی ژیانیان لێ زەوت دەکات.

بۆیە لەم نێوەندەدا سزادان دەبێتە ئەو شێوازە ئاسانەی، کە دایکان لەگەڵ منداڵەکانیان بەکاری دەهێنن. لە کاتێکدا ئێمە دەزانین منداڵ لە ڕێگەی سزاوە پەروەردە ناکرێت، ئەوەیش کە بە نان و سزا گەورە کراوە، پێمان وا

نییە کەسێتییەکی تەندروستی هەبێت. کێتان بینیوە شانازی بەوەوە بکات کە بە تێهەڵدان بووە بە پیاو! ڕاستە لەوانەیە گیانداران بە سزادان ڕابهێنرێن، بەڵام هەرگیز ئەوەمان بیر نەچێت مرۆڤ بە سزا چاک نابێت، ئەو مەخلوقێکە دەبێ ویژدانی بدوێنیت.

## ٣- ڕووکەشی کێشە، ڕەگوڕیشەی کێشە

کاتێك کێشەیەک دێتە بەردەم پسپۆڕانی بواری پەروەردە، سەرەتا دەیکەن بە دوو بەشەوە: ڕووکەشی کێشەکە، لەگەڵ ڕەگوڕیشەکەی. بۆ نموونە؛ ئەو دایکەی لە منداڵەکەی دەدات و بەرگەی هیچ هەڵسوکەوتێکی ناگرێت، لە دۆخی ئاساییدا ئەو ڕەفتارەی بە ڕووکەشی کێشەکە دادەنرێت، واتە کێشە بنەڕەتییەکە نییە، بەڵکو ڕەنگدانەوەی کێشەیەکی ترە کە دایکەکە هەیەتی. لەبەر ئەوە هەتا نەچینە بنجوبناوانی کێشە بنەڕەتییەکە و چارەسەری ئەوێ نەکەین، شەڕانگێزیی دایک بەرامبەر منداڵەکەی کۆتایی نایەت.

لەم ڕووەوە، ئەو بڕگانەی لەسەرەوە ڕیزمان کردن، هەر کامیان دەڵێی بۆخۆی کێشەیەکی بنەڕەتییە کە ڕەگوڕیشەی دەروونی هەیە. با بە نموونەیەک ئەمە زیاتر ڕوون بکەینەوە؛ ئەگەر دایکێک هەستی بە خۆشەویستی و گرنگیپێدان نەدەکرد لەلایەن هاوسەرەکەیەوە، یان با بڵێین خەسووی حسابی بۆ نەدەکرد، ئەوسا هێدی هێدی کێشەی بنەڕەتی لە دنیای هەستەکانی ئەو دایکەدا دەست دەکات بە کەڵەکەبوون. چەند ساڵێک ئەمە هەر وا دەمێنێتەوە، نە کەس هەستی پێ دەکات، نە کەسیش دەیبینێت. جاروبار تووڕە دەبێت و دەماقاڵە ڕوو دەدات، بەڵام ئەو وا بیر دەکاتەوە کە کێشە بنەڕەتییەکەی بیر چووەتەوە و چیدی کاری تێناکات. بەڵام، بە تێپەڕبوونی کات شتێکی بۆ دەردەکەوێت: دەبینێت ئەو شتانەی جاران بە چاوی لێبووردەییەوە بۆی دەڕوانی و ئارامی

لەسەر دەگرت، ئێستا تەحەمولی نەماوە بەرامبەریان. ئیدی شتەکان یەکە بە یەکە دەردەکەون.

> **بەشێک لە دایکان پێیان وایە سزادان بێوەیترین ڕێگەیە لەگەڵ منداڵەکانیان بەکاری بهێنن.**

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێ دا، ئەو دایکەی پێشتر منداڵەکانی یارییان لەسەر پشتی دەکرد و ئەویش بە ڕوویەکی گەشەوە بۆی دەڕوانین، ئێستا بەس بۆ ئەوەی خواردن نەڕێژن بە خۆیاندا، چاویان لێ سوور دەکاتەوە و قۆڵیان ڕادەکێشێت و دنیایەک قسەی ناپێویستیان پێ دەڵێت. لە ڕاستیدا کێشەی دایک لەو کاتەدا ئەوە نییە منداڵەکەی خواردنەکەی نەڕێژێت بە خۆیدا، کێشەی ڕاستەقینە ئەوەیە کۆڵەکانی سەرشانی لە ڕۆحیدا قووڵبوونەتەوە و بوون بە کێشەی بنەڕەتی. ئەو کێشە بنەڕەتییە، یان ڕاستتر بڵێین، ئەو برینە قووڵەی ناو ڕۆحی دایک وای لێ دەکات کە هەموو ئانوساتێک لەسەرپێ بێت بۆ ئەوەی بە یەکێکدا بتەقێتەوە و کاردانەوەی نائاسایی بنوێنێت. بەداخەوە، یەکەم ناونیشانیش کە بەسەریدا دەتەقێتەوە، ئەو بوونەوەرە بێتاوانەیە کە بە بەشێک لە خۆی هەژمار دەکات.

منداڵ موڵکی دایکە، ئاخر ئەو هێناویەتە دنیاوە. ئەو خۆشەویستییە بێئەندازەیەی کە بۆ منداڵەکەی هەیەتی، لە هەمان کاتدا وای لێ دەکات خەیاڵی ئەوەی لا دروست بکات کە سەربەستە لەوەی چۆن دەیەوێت ئاوەها لەگەڵیدا بجووڵێتەوە.

لە کاتێکدا بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە لەگەڵ شکۆی مرۆڤدا یەک ناگرێتەوە، چونکە ئێمە دەزانین هیچ کەسێک ماڵ و موڵکی کەسێکی دیکە نییە، هیچ کەسێکیشمان مافی ئەوەی نییە هەر لەبەر ئەوەی بووەتە هۆکاری

هـاتنە دنیـای منـداڵێک، ئیـتر چـۆن پێـی خۆشـە بەو شـێوەیە مـامەڵەی لەگەڵ بکات: "منداڵی خۆم نییە؟ ئـارەزووی چـیم بێـت ئەوە دەکەم!" ڕاسـتە بە هـۆی دایـک و بـاوکیەوە هـاتووەتە دنیـا، بەڵام خـۆ مـافی ئەوەی هەیە ژیـانێکی سەربەخۆی هەبێت.

ڕەوا نییە دایک بە هۆی لاوازییەکانی خۆیەوە، نمایشی هێـز و بـازوو بەسـەر ڕۆڵەکەیدا بکـات، نە ئـایین نە کلتـوور وە نە شـکۆی مـرۆڤیش ڕێـگە بەو کـارە نادەن. سەرپەرشتیارانی منداڵ مـافی ئەوەیـان نیـیە دنیـای بـێگەردی منـداڵی لە ڕۆڵەکانیـان زەوت بـکەن، بە هەر پاسـاو و لەژێـر هەر پەردەیەکـدا بێـت؛ جـا سزادان بێت یان توندوتیژی یـان قۆسـتنەوەی سـۆزداری. لە هەنـدێك حـاڵەتی تردا دایک نـایەت لە ڕێـگەی تونـدوتیژی و سـزادانەوە داخـی کـۆڵە گرانەکـانی سەرشـانی بە منـداڵەکەی بڕێژێـت، بەڵکـو دێـت دنیـای بـێگەردی منـداڵەکەی دەکاتە پەناگەیەک بۆ خۆی.

> **ڕەوا نییە دایک بە هۆی لاوازییەکانی خۆیەوە، نمایشی هێز و بازوو بەسەر ڕۆڵەکەیدا بکات، نە ئایین نە کلتوور وە نە شکۆی مرۆڤیش ڕێگە بەو کارە نادەن.**

دەچێـت گـرفتە ئاڵۆسـکاوەکانی خۆی لای منداڵەکانی بـاس دەکـات، لەبەرچـاوی ئەوان بەرگـی بێتـاوانی و ستەملێکراوی دەپۆشـێت، سـا بەڵکـو لەو ڕێیەوە پەیوەنـدیی سـۆزیان لەگەڵ دروست بکات.

بـۆ نمـوونە؛ ئەو دایـکەی کە لەگەڵ خەسووەکەیدا نێوانی خـۆش نییە، دەزانن بە چی دڵی خۆی دەداتەوە؟ دێت ناحەقییەکـانی خەسـووی بـۆ منداڵەکانی باس دەکـات، ئـاخر کەی ئەوان سـەر لەو مەسـەلانە دەردەکەن!

هەر ئەوەندە نا، بەڵکو هەستی منداڵەکانی بەکار دەهێنێت لەپێناو ئەوەی دڵی خۆی ئاو بخواتەوە، وا دەکات منداڵەکانی ڕقیان لە داپیرەیان بێت.

دەبێت لێرەدا ئەوە بڵێین، ئەم حاڵەتە هیچی لە بەکارهێنانی توندوتیژی و لێدان کەمتر نییە. باسکردنی کێشەی نێوان گەورەکان و داواکردنی ئەوەی بەرەی لایەک بگرن بۆ منداڵانێک کە هێشتا توانای فامکردن و چارەسەرکردنی کێشەیان نییە، بەتەواوی مانا قۆستنەوەی بێگەردیی منداڵ و دەستبەسەرداگرتنی هەستەکانیەتی.

ڕاستە، لەوانەیە بەو شێوەیە منداڵ ببێتە هاوڕازی دایکی، بەڵام -وەک لە نموونەکەی سەرەوەدا بینیمان- ئەو منداڵە بێتاوانە لەنێوان خۆشویستنی دایک و داپیرەیدا گیر دەخوات و ڕۆحی ئازار دەچێژێت. ویژدانی منداڵ بەرامبەر ئەو چەشنە حاڵەتانە خۆی بێهەست دەکات، کە ئەوەش بە سەرەتای لەدەستدانی چەندین لایەنی ویژدانی دادەنرێت.

لە هەموو ئەمانەوە بۆمان دەردەکەوێت، ئەگەر دایک بە کۆڵ و قوورساییەکانی سەرشانیەوە بەردەوام بێت لە ژیان، چار نییە تووشی جۆرەها هەڵە و پێشێلکردن دەبێت، جا پێی بزانێت یان نا، ئەقڵی نائاگای بەردەوام ئاڕاستەی دەکات.

# پرۆسەی ناسینی منداڵ لە لایەن دایکیەوە



## ناسینی منداڵ

لە بەشی پێشوودا باسمان لەوە کرد، چەندە گرنگە دایکان خۆیان بناسن و هەست بەو کۆڵ و بارانە بکەن کە هەڵیان گرتووە. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە بپرسین: ئایا خۆناسینی دایک و زانینی ئەو ژینگەیەی منداڵەکەی تێدا پەروەردە دەکات بەسە؟

بێگومان نەخێر، چونکە یەکێک لە پایە هەرە گرنگەکانی پێگەیاندنی منداڵ بریتییە لە ناسینی. واتە منداڵەکەت نەناسی، ناشتوانیت پەروەردەی بکەیت. تاکو دایک و باوک تایبەتمەندییەکانی کۆرپەکەیان نەزانن و لێهاتنی وردبینی و چاودێری لە خۆیاندا پەرە پێ نەدەن و فێری ئەوە نەبن منداڵ لە چ قۆناغێکی گەشەیدا چ جۆرە هەڵسوکەوتێک دەکات، ناتوانن لە پێگەیاندنی منداڵەکەیاندا سەرکەوتوو بن. بۆیە جێی خۆیەتی لێرەدا باس لە سێکوچکە گرنگەکەی پەروەردەی منداڵ بکەین، کە ئەوانیش: هۆشیاربوونەوەی دایک، ناسینی منداڵ، هەروەها دروستیی ئەو شێوازە پەروەردەییەیە کە لەگەڵ منداڵدا بەکار دەهێنرێت.

ئیدی لێرە بەدواوە با بەکورتیش بێت، دەست دەکەین بە چوونە ناو دنیای منداڵەوە. هەموو ئەوانەی ئێستا گەورەن، ڕۆژێک لە ڕۆژان منداڵ بوون. وردەکارییەکانی ئەو تەمەنەش لەناو ئەو شتانەدایە کە بەزەحمەت بیرمان دەکەونەوە، لەناو قاسە پۆلایینەکەی نەستدا وەک نهێنی هەڵگیراون.

ناوەڕۆکی ئەو قاسەیەش وەڵامی ئەو پرسیارەی تێدایە، کە گەورەکانی ئەمڕۆ بۆچی بەم جۆرەن؟ هەر وەک چۆن پێوانە و ئەندازەگیریی ئەندامەکانی جەستەمان لە شریتی (DNA)یەکانماندا شاراوەن، هەر بەو جۆرە هەموو ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی لە منداڵیدا بەسەرماندا هاتوون، بناغەی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ئێستامانیان داڕشتووە.

## شوێنەواری منداڵی بەسەر گەورەکانەوە

کاتێك لەنزیکەوە لە هەڵسوکەوتی گەورەکان دەکۆڵینەوە، دەبینین زۆرێک لە هەڵسوکەوتەکانیان بێمانا و نابەجێن. بۆ نموونە؛ زۆر بەزەحمەت متمانە بە بەرامبەرەکانیان دەکەن، تەنانەت کردوویانە بە جۆرێک لە دانایی و بەشانازییەوە دەڵێن: "نابێت متمانە بە باوکی خۆیشت بکەیت!" تۆ بڕوانە ئەم درمە گوازراوەتەوە بۆ زۆرێک لە هاوسەرانیش و ناتوانن بە هەستێکی پڕ متمانەوە یەکانگیر ببن، هێشتا لەیەکتر مارە نەکراون، کەچی پێشبینی ئەوە دەکەن کە: "ئەی ئەگەر جیابووینەوە!"

خۆزگە گرفتی گەورەکان تەنیا نەبوونی متمانە بووایە، چونکە پەرچەکرداری بەهانەهێنانەوە و بەرگریکردنیشیان زۆر بەهێزە. بەردەوام لە ئامادەباشیدان بۆ بەرپەرچدانەوە و خۆپارێزی، چونکە ترسی ئەوەیان هەیە شتێکیان پێ بوترێت یان یەکێک ڕەخنەیەکیان لێ بگرێت. بیر لەو وەڵامانە بکەنەوە کە یەکێک لە ئێمە دەیداتەوە کاتێك دوا دەکەوێت لە دەوام، یان کە هاوسەرەکەمان لێمان دەپرسێت: "خێرە وا هیچت لێنەناوە؟".. ئەوجا دەبینن چۆن بە پەرچەکرداری بەهانەهێنانەوە و بەرگریکردن باری خۆمان قورس کردووە، نەبادا هەست بە کەمی بکەین، یان سووکایەتیمان پێ بکرێت.

پرسیارە جەوهەرییەکە ئەمەیە: ئایا ئەم حـاڵەتە هەر وا لە خـۆوە دروست بـووە، یـان بە درێژایـی تەمەنمـان بە چەنـدین قۆناغـدا تێپەڕیـوە، هەتـا گەیشتووەتە ئەم دۆخەی ئێستای؟

پرسیارەکە وردتر دەکەینەوە: ئەگەر دەڵێـی بە تێپەڕبـوونی کـات وای لـێ هاتووە، ئەدی لەو قۆناغەدا بـووە کە هەسـتی بە بەهێـزی و توانسـتی خـۆی کردووە، یاخود لەو قۆناغەدا بووە کە توانای ئەوەی نەبووە بەرگری لە خـۆی بکـات، ئیـتر ئەویـش بەو جـۆرە بەرپەرچـی ئەو مەترسـی و هەڕەشـانەی داوەتەوە کە کــراونەتە ســەر کەســێتییەکەی؟ دەی خــۆ وەڵامەکە ڕوونە، زۆربەی ئەو هەڵسوکەوتە بێمانایانەی گەورەکـان دەینـوێنن، دەگەڕێـتەوە بـۆ ئازار و سوێی ئەو هەڕەشە و گورزانەی کە لە منداڵیـدا چەشـتوونی، واتە لەو تەمەنەدا کە بێدەسەڵات و بێچارە بووە. بە دەربڕینێکی تر؛ گەورەکـان لەژێـر کاریگەریی ئەو میکانیزمە بەرگرییانەدا ژیان بەسـەر دەبەن، کە لە منداڵییانـدا بۆ خۆپارێزی پەنایان بردووەتە بەر.

ئەوانەی لە منداڵیـدا بەردەوام تەریـق کـراونەتەوە و حسـابیان بـۆ نەکـراوە و ڕاچڵەکێـنراون، لە گەورەیـدا لە دڵەڕاوکێـدا دەژیـن، چـونکە ئەقڵـی نائاگـای ترسی ئەوەیەتـی دیسـانەوە تووشـی هەمان شـت ببێـتەوە. ڕەنگـدانەوەی ئەم حــاڵەتە ناتەندروســـتەش لەو ڕەفتــارە نابەجێیــانەدا دەبینــین، کە هەنــدێك جــار هاوســەران یــان هاوڕێیان بەرامبەر یەکتر دەینوێنن.

> **سێکوچکە گرنگەکەی پەروەردەی منداڵ بریتین لە: هۆشیاربوونەوەی دایک، ناسینی منداڵەکەی، دروستیی ئەو شێوازە پەروەردەییەی لەگەڵ منداڵدا بەکار دێت.**

بەداخەوە، شـوێنەواری ئەزمـوونە تاڵەکانی منداڵی هەرگیز ناسـڕێنەوە.

هەر چەندێکیش ئێمە وا بزانین کە لەبیر دەچنەوە و لە قووڵاییەکانی بیرماندا دەشاردرێنەوە، بەڵام ئەوە ڕاستییەکە کە هەر ئەو بەسەرهات و هەستانەی منداڵین کارەکتەری مرۆڤ پێک دەهێنن.

لەبەر ئەوە زۆر بێمانایە بە کەسێکی پێگەیشتوو بڵێیت: "خۆ هیچ شتێک نەبوو ببێتە هۆی ئەوەی بەو چەشنە بجووڵێیتەوە!" چونکە پاڵنەری ڕاستەقینەی ڕەفتارەکەی شتێک نییە بۆ ئەمڕۆ بگەڕێتەوە، بەڵکو سەرهێنانە دەرەوەی بەشێکە لەو ڕابردووە زامدارکراوەی کە نوقمی نەست کراوە. جا بۆیە هەستیاریی قۆناغەکە وا دەخوازێت دایکان شێلگیرانە قۆڵی لێ هەڵبماڵن و بەبایەخەوە بۆ ئەرکی سەرشانیان بڕوانن.

کەسێک دەتوانێت هەڵسەنگاندنی دروست بۆ منداڵ بکات، کە ئەو کەسە منداڵەکە بە بەشێک لە خۆی و تەواوکاری خۆی نەبینێت. ئەگەر نا، هەڵسەنگاندنەکان بێبەش نابن لە چەوتی و نەپێکان.

مەلیکە، چیرۆکی کەسێک کە دەیەوێت ڕاستی ببینێت

> **ئەوانەی لە منداڵیدا بەردەوام تەریق کراونەتەوە و حسابیان بۆ نەکراوە و ڕاچڵەکێنراون، لە گەورەییدا لە دڵەڕاوکێدا دەژین، چونکە ئەقڵی نائاگای ترسی ئەوەیەتی دیسانەوە تووشی هەمان شت ببێتەوە.**

مەلیکە، کچە جوانەکەی گوند، دەبێتە دڵخوازی کوڕە قۆزەکەی گوند کە ناوی محەمەدە. ئەوینی نێوان ئەوم دوو دڵخوازە دەکەوێتە سەر زاری گوندنشینان. دواجار خانەوادەی کوڕەکە دەچنە خوازبێنیی مەلیکە خاتوون، بەڵام وا دیارە قەدەر شتێکی تری بڕیار داوە. ڕۆژێک بەر لە ئاهەنگ، مەلیکە تووشی ڕووداوێکی هاتوچۆ دەبێت و بەو هۆیەوە چاوی لەدەست دەدات.

هەرچی ئەوین و خۆشەویستیی نێوان دوو ئەویندارەکەشە، دەبێت بە بەشێک لە ڕابردوو.

خێزانی مەلیکە زۆر دڵگران دەبن بە کارەساتەکە و ژاکانی گوڵی خۆشەویستیی نێوان کیژەکەیان و محەمەد. بۆیە بڕیار دەدەن ئەمە بە کچەکەیان نەڵێن و بیدەن بە (حەمە شێت)ی گوندەکەیان، دەنگی حەمەش، زۆر لە دەنگی دەستگیرانەکەی پێشووی دەچوو!

بە تێپەڕبوونی کات، خۆشەویستییەکی بێئەندازە لە دڵی مەلیکەدا بەرامبەر محەمەدی مێردی دروست دەبێت، مەگەر ئەو نەبوو گوێی نەدەدایە نابینایی چاوەکانی مەلیکە و چۆن بوو ئاوا خۆشی دەویست! ژن و مێرد پێکەوە ژیانێکی ئاسوودە بەسەر دەبەن و چوار منداڵیان دەبێت. یەکێک لە منداڵەکان زۆر خەفەت دەخوات بۆ نابینایی دایکی و پاش ماندووبوونی چەند ساڵە، دەبێت بە پزیشکی چاو. دوا جار خەونی منداڵی بەئەمەک دێتە دی و دایکی دەباتە ژووری نەشتەرگەری، بەو ئومێدەی ڕۆشنایی بۆ چاوەکانی دایەی بگەڕێنێتەوە.

پاش بێداربوونەوەی دایکی سینەپڕخەم، کوڕەکەی بەسەرسوڕمانەوە دەچێتە لای: "دایە گیان سەرم سوڕماوە، لە لایەکیشەوە زۆر دڵخۆشم، مژدەیەکی خۆشم پێیە بۆت!"

- دەزانم دەڵێی چی کوڕی خۆم، دەزانم. منیش نهێنییەکم هەیە، وا دەزانم ساتی درکاندنی هاتووە.

- نهێنی! نهێنیی چی دایە گیان؟

- تۆ سەرەتا هۆکاری سەرسامییەکەتم پێ بڵێ، ئەوجا منیش نهێنییەکەی خۆمت پێ دەڵێم.

لە کاتی نەشتەرگەریدا بۆم دەرکەوت چاوەکانت ساغن و عەیبیان نییە. ئاخر ئەمە واتای چی؟

- جا با منیش نهێنییەکەی خۆمت پێ بڵێم، کاتی خۆی وا بڕیار بوو شوو بکەم بە کەسێک کە زۆرم خۆش دەویست، ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەمان ڕووداوێکی ناخۆشم بەسەردا هات، لە خۆوە بیرۆکەیەک هات بە مێشکمدا: "ئەمە باشترین هەلە بۆ تاقیکردنەوەی هاوژینی ژیانم، تاکو بزانم چەندە منی خۆش دەوێت." بۆیە چاوەکانم داخست وخۆم لێ کردن بە نابینا. ئەوەندەی نەبرد دەستگیرانەکەم وازی لێ هێنام و جێی هێشتم. بەڕاستی ئەزموونێکی قورس بوو لەسەرم. لە لایەکەوە خەفەتبار بووم، چونکە دڵی خۆمم سپاردبوو بە کەسێکی هەڵە کە مانای خۆشەویستی نەدەزانی، لە لایەکی تریشەوە دڵخۆش بووم بەوەی کە زوو بۆم دەرکەوت. ئەی ئەگەر دوای گواستنەوە هەر بەڕاستی وام لێ بهاتایە، ئەوکات چی؟ هەر لەو ساتەوە بڕیارم دا کەسێک هەڵبژێرم کە ڕەوشتی جوانە، نەک ڕووکەشی. پاشان دایک و باوکم نیان دا بە دڵپاکترین و خاکیترین لاوی گوندەکەمان، واتە باوکتان. بۆ تەنیا جارێکیش قسەیەکی نەکردووە بۆنی ئەوەی لێ بێت، کە من نابینام یان بەو ۆیەوە دڵم بشکێنێت. منیش بە دڵ و بە گیان خۆشم ویست و ئەوینی ئەوم سەروو هەموو شتێکەوە دانا. نابینایيم شتی وەهای نیشان دام، کە هەرگیز چاوساغی نەمدەتوانی ببینم. بۆ نموونە؛ بەشێک لە ناسیاوەکانم تەنها لەبەر ەوەی نابینم، خۆیان دوور دەگرت لێم و بەکەم تەماشایان دەکردم. ئەمە ئەو سە بێوەفایانە بوون کە چاوە نابیناکانم نیشانیان دام. هەندێکی تریش بێ ێدانە کەمئەندامیم، هەر وەک جاران گەرموگوڕ بوون لەگەڵمدا و بە موو شێوەیەک منیان لەلا قبوڵ بوو.

- بۆ خاتری خودا ئەوە تۆ دەڵێیت چی دایە. واتە تۆ هەموو ئەو ماوەیە دەتبینی؟

- درۆی چیت لەگەڵدا بکەم کوڕی خۆم، ئەرەوەڵا دەمبینی. لەوەتەی لە چاو و نەفس و ئارەزووەکانم خۆم داماڵیوە، لە جاران جوانتر دەورووبەرەکەم دەبینم.

## تاوەکو دایك خۆی لە خۆی دانەبڕێت، ناتوانێت منداڵەکەی بناسێت.

هاوشێوەی چیرۆکەکەی مەلیکە، هەتا دایکان خۆیان لە ئارەزووە کەسییەکانیان دانەبڕن، ناتوانن بە شێوەیەکی ڕاستەقینە ڕۆڵەکانیان بناسن. چونکە ئەوەی دایک لە ئاست منداڵەکەیدا (نابینا) دەکات، جگە لە (خۆی) هیچ شتێکی تر نییە.

## دایکی خۆپەرست نییە، بەڵام...

باوەڕ ناکەم هیچ دایکێک بەرامبەر منداڵەکانی خۆپەرست بێت. بۆ ئەوەی پاروویەک بکات بە دەمی منداڵەکەیەوە، نان و ئاو لە خۆی دەگرێتەوە. خۆی دەکاتە قوربانی، بەس بۆ ئەوەی پەنجەیەکی کۆرپەکەی ئازاری پێ نەگات.

بەڵام نابێت ئەمە وامان لێ بکات واقیعبین نەبین، ڕاستە دایکان (خۆپەرست) نین، بەڵام ئەوەش ڕاستییەکە کە زۆربەی دایکانی ئەمڕۆ (خودسەنتەرن). منداڵەکانیشیان گیریان خواردووە بەدەستیانەوە، پەلەقاژەیانە خۆیان لە دەستی دایکیان قوتار بکەن و پارێزگاری لە شکۆی خۆیان بکەن.

## جیاوازیی نێوان دایکی خۆپەرست و دایکی خودسەنتەر

جێـی داخە کە زۆرێـک لە دایکـانی ئەم سـەردەمە، لەسـەر بنەمـای خودسەنتەری مامەڵە لەگەڵ ڕۆڵەکانیـان دەکەن. بـا زیـاتر لەسـەر ئەم خـاڵە بوەستین:

خۆپەرستی دۆخێکی ئاگایـانەیە، واتە دەزانـی چـی دەکەیـت، بڕیـارێکە پەیوەندیی بە هۆش و ویستەوە هەیە. هەریەکەمان بە ئەقڵ و ویستی خۆمـان خۆپەرستی هەڵدەبژێرین، یـان خۆمـانی لـێ بەدوور دەگـرین. بـۆ نمـوونە؛ دایکێک کە دەست دەبات بۆ دوایەمین پارووی سەر سفرە، یەکسـەر دەسـتی دەکێشێتەوە کە دەبینێـت منـداڵەکەی حەزی لە هەمـان پـاروە. واتە سـەرەتا لەسەر ئاستی هزری پێی دەزانێت، ئەوجا دواتر هەستی پێ دەکات.

کەچی بەپێـچەوانەی ئەمەوە، خودسـەنتەری لەدەرەوەی هـۆش و ئەقڵـی بەئاگـا گەشـە دەکـات، زۆر جـار کەسـەکە هەر بە خۆیشـی نازانێـت کە خودسەنتەرە، پێشی بڵێیت ڕەنگە قبوڵی نەکات. بـۆ نمـوونە؛ ئەو دایکـانەی خودسەنتەرن، تا بڵێی تـامەزرۆی منـداڵەکانیانن. هەر بـۆیە بـێ ئەوەی پێـی بزانێت، لەبری ئەو بیر دەکاتەوە، بڕیار دەدات، پرسیار دەکـات، پێـدەکەنێت، دەگری، تەنانەت نەخشەی دواڕۆژیـش دادەڕێژێـت. وەک ئەوەی، خـۆی لە منداڵەکەیدا دەبینێتەوە و لەودا دەژی. بەوجۆرە منـداڵی بەسـتەزمان دەرفەتـی ئەوەی نـادرێتێ خـۆی پێبگەیەنێـت و ناسـنامەی خـۆی گەشـە پـێ بـدات. شوێنەکە هی ئەوەیە پێبکەنێت، کەچی ئەو ناتوانێت بەدڵی خۆی پێبکەنێـت. حاڵەتەکە هی ئەوەیە بگریەت، بەڵام ئەو نازانێت بگریی باشە یـان نـا. ئەگەر دایکی پێی وا بوو کاتەکە کاتی گریان نییە، ناشهێڵێت منداڵەکەی بگریی.

ئەوەی دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە، ئەو جۆرە دایکانە ناتوانن منداڵەکانیان بناسن. لەبەر ئەوەی هەر چی ببینێت لە منداڵەکەیدا، لە ڕاستیدا خۆیەتی، ڕەنجی خۆیەتی، ئیتر چۆن پانتاییەک دەمێنێتەوە بۆ بوونی منداڵی بێچارە!

## بۆچی دایکان خۆیان لە منداڵەکانیاندا دەبیننەوە؟

کیژێک کە نەتوانیبێت لە منداڵیدا چێژ لە منداڵیی خۆی وەربگرێت و بوونی خۆی بسەلمێنێت، کاتێک گەورە دەبێت و دەبێت بە دایک، هەوڵ دەدات لە منداڵەکانیدا خەونەکانی بهێنێتە دی. بۆ نموونە؛ ئەو دایکە خودسەنتەرەی لە منداڵیدا حەزی کردووە ببێت بە پزیشک، بەڵام هەلومەرجەکان ڕێگەیان نەداوە ئەو خەونەی بهێنێتە دی، دەبینی چی لە توانایدا بێت درێغی ناکات بەس بۆ ئەوەی کوڕەکەی یان کچەکەی ببێت بە پزیشک، مافی ئەوەشیان ناداتێ لە تاقیکردنەوەیەکدا نمرەی کەم بهێنن، یان لە وانەکانیاندا (سەرکەوتوو) نەبن. دەرامەت و باری ئابووریی هەرچۆن بێت، خۆی بە ناچار دەزانێت بیانێرێتە ئەم خول و ئەو خول، بچووکترین (شکست)ی منداڵەکەی ئازاری دەدات و تووڕەیی لە ناخیدا دروست دەکات.

وەنەبێت ئەم جۆرە دایکانە سستی بنوێنن لە خۆشویستنی منداڵەکانیان، بەپێچەوانەوە گیانی خۆیشیان بۆ دەکەنە قوربانی. شەو و ڕۆژ دەخەنە سەر یەک، بەس لەبەر ئەوەی منداڵەکانیان سەرکەوتن بەدەست بهێنن. کەچی کە پرسیار لە منداڵەکان دەکەین، ڕەنگە حەز نەکات بچێتە بواری پزیشکییەوە، یان لەوانەیە ئەوەندە هەستیار بێت لە ڕووی سۆزدارییەوە، بە بینینی خوێن لەهۆش خۆی بچێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دایکەکە لە هەستکردن بە منداڵەکەیەوە دوورە، ئاگای لەم شتانە نییە. بۆ؟ چونکە هەتا ڕێگە نەدات

منداڵەکەی بوون و کەسێتیی خۆی بسەلمێنێت، ناتوانێت لەنزیکەوە بیناسێت. بەلای ئەم دایکانەوە لەوە ناخۆشتر نییە بەو چاوەوە بڕوانێتە منداڵەکەی، کە ئەویش دنیایەکی سەربەخۆیە و دارای ویست و هەڵبژاردەی ئازادی خۆیەتی. خۆ ئەگەر ببینێت منداڵەکەی باس لە هەست و بیرکردنەوەکانی خۆی دەکات، ئەم لەولاوە وا دەزانێت ڕەنجبەخەسار بووە و بێئەمەکی بەرامبەر کراوە.

دایکی خودسەنتەر تەنها بەوە واز ناهێنێت منداڵەکەی بکاتە ئامرازی تێرکردنی خەون و خولیاکانی خۆی و بەس، بەڵکو جاری وایە لە پەرۆشیی ئەوەی بەسەر خۆیدا هاتووە بەسەر منداڵەکەیدا نەیەت، دەچێت منداڵەکەی (ئالوودە)ی خۆی دەکات. کۆتوبەندی دەکات و ناهێڵێت بێ ئاگاداری خۆی هەنگاو بنێت. ئیتر منداڵەکە چەندە ئالوودەی دایکی بێت، ئەو ئەوەندە هەست بە ئاسوودەیی دەکات. بۆ نموونە؛ ئەو دایکەی لە منداڵیدا تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە، ناهێڵێت منداڵەکانی هەنگاو بنێنە دەرەوە، کاتێک بە ڕێگادا دەڕۆن دەستیان بەر نادات، کاتێک لە پارکێکیشدا سواری خلیسکێنە یان جۆلانە دەبن، ئۆقرەی لێدەبڕێت لە خەمی ئەوەی خلیسکانەکە بکەوێت یان پەتی جۆلانەکە بپچڕێت. واتە دایکەکە لە منداڵەکەیدا دەژی. ڕێگە نادات بەبێ ئاگاداری خۆی هیچ شتێک بکات، بەم شێوەیەش دایکەکە سەرکەوتوو دەبێت لە ئالوودەکردنی منداڵەکەی بە خۆیەوە. جا دایکێکی ئاوا، چۆن دەتوانێت ئاشنای ڕۆحی منداڵەکەی ببێت! زەمینەیەکی نەهێشتووەتەوە منداڵەکە هەست بکات کە بوونی هەیە، ئەوەی لەگۆڕێدایە پاوانخوازی ڕۆحی زامداری دایکێکە، کە دەیەوێت ڕۆحی منداڵەکەی داگیر بکات.

لەپاڵ هەموو ئەمانەدا، ئەگەر ئەو دایکە لە منداڵیی خۆیدا مۆدێلێکی تەندروستی (دایکایەتی) لەبەرچاو نەبووبێت و گرفتێکی نەبینێت بەجوانی

چارەسەر کرابێت و گەنجێتییەکەی بە قڕە و بۆڵە بەسەر بردبێت، ئەوسا بە ڕۆحی منداڵەکەیەوە دەنووسێت و هەوڵ دەدات لەو ڕێگەیەوە بۆشایە سۆزدارییەکانی پڕ بکاتەوە و ئەو برسێتییەی هەیەتی بۆ خۆشەویستی، دەستەبەری بکات و ئازارەکانی ڕابردووی لەیاد بکات و بەخۆباڵادەستکردنی بەسەر منداڵەکەشیدا، قەرەبووی ئەو هەستی بێبەهایی و خۆبەکەمزانینە بکاتەوە کە لە منداڵیدا لە دەروونیدا هەڵکۆڵراوە.

دایکی بێچارە لەمنداڵیدا زۆر شکێنراوە و توانای ئەوەشی نەبووە هیچ بەرگرییەك لە خۆی بکات. جەستەی بێهێزی هەمیشە لەناو بێچارەییدا گەوزاوە و بەسەرهاتەکان برینی قووڵیان لە ڕۆحیدا دروست کردووە.

دایکێکی لەم جۆرە، بزێوی و گاڵتەوگەپی منداڵەکانی بە هەڕەشە دەبینێت بۆ سەر خۆی و بەرەقی لە ڕوویاندا دەوەستێتەوە. ناتوانێت بە چاوی بێلایەنەوە تەماشایان بکات، ئاخر ئەو لەواندا خۆی دەبینێتەوە.

لەم ڕووەوە، پێویستە بە گیانێکی لەخۆدابڕاو و چاوێکی بابەتییانەوە، بڕگە و بەشەکانی دواتر بخوێنینەوە. چونکە ناکرێت منداڵەکەت بە خۆتەوە بەستبێتەوە و خوازیاریش بیت سوود لەم باسانە وەربگریت.

## ململانێی نێوان دایك و منداڵ: جەنگی شکۆمەندی

هەموو گیاندارێک، سروشتێکی تایبەت بە جۆرەکەی خۆی هەیە. بۆیە لەم ڕووەوە پەروەردەکردن و ڕاهێنانی گیانداران بە کارێکی قورس دانانرێت. بۆ نموونە؛ لە هەموو دنیادا سەگەکان تا ڕادەیەک وەک یەک ڕادەهێنرێن، چ کات بەو جوولەیە هەستا کە ڕاهێنەرەکەی دەیەوێت، بە پارچەیەک گۆشت خەڵات دەکرێت، ئەگینا سزا دەدرێت. بنەما گشتییەکانی ڕاهێنانی سەگ بیهێنە و ببە لەوە تێپەڕ ناکات.

ئەگەر بتانەوێت شتێکی پێ بکەن، هەر ئەوەندە بەسە لەسەر شێوەی فرمان لێی دووپات بکەنەوە و بە تۆنی دەنگ و نیگاکانیشتان سووربوونی خۆتانی نیشان بدەن.

بۆ ئەوەی سەگێک ملکەچی فرمانەکانی خۆتان بکەن، سەرەتا دەبێت (ویست)ی لێ زەوت بکەن و گوێ بەو (بەرهەڵستییە) نەدەن کە بەرامبەرتان دەینوێنێت، چونکە هیچ سەگێکی خاوەن ویست و بڕیار، هەر وا مل بۆ فرمانی ڕاهێنەرەکەی یان خاوەنەکەی شۆڕ ناکات. کەوایە خاوەن سەگەکان چ ڕێگەیەک دەگرنە بەر؟ دێن هەر جارە و شێوازێکی لەگەڵ تاقی دەکەنەوە؛ جارێك برسی دەکەن و دەیخەنە ژێر فشارەوە، جارێکی تریش دەستی پێدا دەهێنن و یاریی لەگەڵ دەکەن، ئیدی بەو جۆرە ئیرادەی ئەو گیاندارە بەستەزمانە زەوت دەکەن و دەیانخەنە ژێر فرمانی خۆیانەوە.

ئەگەر بتەوێت سەگەگە دابنیشێت، ئەوەندە بەسە بە شێوەیەکی شێلگیرانە بانگی لێ بکەیت: "دابنیشە!" گیاندارەکەش لەلایەن خۆیەوە سەرەتا تەماشای چاوت دەکات، هەوڵ دەدات بزانێت چیت دەوێت. بۆیە کە دەیەوێت ئیرادەی خۆی بخاتەگەڕ و هەستێت بڕوات، دەبێت دیسانەوە گوێی لێت بێت کە دەڵێی: "دابنیشە!"

سەگەکە هێشتا هەر حەپەساوە، هێشتا بەتەواوەتی نازانێت داوای چیی لێ دەکرێت. لەبەر ئەوە وا پێویست دەکات، بە دەستت فشار بخەیتە سەر پشتی و دایبنیشێنیت. ئیتر بەو شێوەیە ئەویش ناچارە لەسەر قاچەکانی چۆک دابدات. ئەی دواتر؟ ئینجا ئێستا پێویستە بەرامبەر چۆکدادانەکەی ئەو، تۆش نەرمی بنوێنیت و بەسۆزەوە مامەڵەی لەگەڵ بکەیت. بەو جۆرە سەرکەوتوو دەبیت لە گەیاندنی پەیامەکەت: "ئەگەر گوێڕایەڵیم بکەیت، منیش بەسۆزەوە لەگەڵت دەجووڵێمەوە."

ئیتر ورده ورده سەگەکە لە فرمانەکەت تێدەگات و بەقسەت دەکات. لەو نێوەندەدا پێویستە تۆش بەردەوام بیت لەسەر پێدانی هەست و سۆز، کە ئەویش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە ئافەرینی بکەیت و بزەی بۆ بکەیت و شتێکی خواردنی بدەیتێ. ئێ چی ڕووی دا؟ زۆر شت! لەمەودوا بۆ ئەوەی خۆشەویستییەکەت لەدەست نەدات، بەردەوام گوێڕایەڵیت دەکات، بە واتایەکی تر؛ خووی گوێڕایەڵیی تێدا دروست دەبێت.

بەم شێوەیە سەگەکە هێدی هێدی ویست و ئیرادەی خۆی دەداتە دەست خاوەنەکەی و چێژ وەردەگرێت لەوەی فرمانەکانی بهێنێتە جێ. هەموو ئەمانەش بەس لەبەر ئەوەی لەلایەن خاوەنەکەیەوە سزا نەدرێت و برسی نەکرێت و بێبەش نەبێت لە سۆز و خۆشەویستییەکەی. تەنانەت پاش ماوەیەک، نەک هەر بە فرمانە زارەکییەکانی خاوەنەکەی ڕادەپەڕێت، بەڵکو وای لێ دێت پەی بە هەستەکانیشی بەرێت. بۆیە کاتێک خاوەنەکەی لە یەکێک تووڕە دەبێت، هەستی پێ دەکات و دەیەوێت پەلاماری بدات. ئەگەر ببینێت خاوەنەکەی دەگری، ئەویش دەست دەکات بە لورەلور و کڕووزانەوە. ئەگەر ئەو شادمان بێت، ئەمیش بە هەمان شێوە دەبێت. واتە چیدی شتێک نەماوە پێی بوترێت ویستی سەربەخۆی گیاندارەکە، چیتر دەیەوێت بەگوێرەی باری دەروونی خاوەنەکەی بژی.

> **" هەرگیز مرۆڤ لە ڕێگەی زەوتکردنی ئیرادە، شکۆ شکاندن، توندوتیژییەوە "**

## ئادەمیزاد وەک ئاژەڵ پەروەردە ناکرێت

گومانی تێدا نییە یەکێک لە هەڵەکانی دایکانی ئەمڕۆ، بەکارهێنانی (نائاگایانەی) ئەو شێوازانەیە کە کەمێک پێش ئێستا ئاماژەمان بۆ کرد. منداڵەکە

چەندە گوێڕایەڵیی دایکی بکات، دایکی ئەوەندە چێژ وەردەگرێت. تۆزێک لەمە دوور بکەوێتەوە، یەکسەر خۆی لەبەرامبەر سزا و توندوتیژیی دایکیدا دەبینێتەوە. جا بۆ ئەو جۆرە دایکانە، لەپێناو دەستگرتن بەسەر ئیرادەی منداڵەکانیاندا چی ناکەن! تا دوا جار سەرکەوتوو دەبن لەوەی جەستەی ڕۆڵەکەیان ببەستنەوە بە ڕۆحی خۆیانەوە.

ئاگادار بن، وتمان (بێئاگایانە) ئەو شێوازانە بەکار دەهێنێت، ئاخر ئەوان ئەوە پیادە دەکەن کە باوە و لەنێو خەڵکدا خواستی لەسەرە. ئەگەر نا، لەکەیەوە زەوتکردنی ئیرادە، شکۆ شکاندن، توندوتیژی ڕێگەیەک بووە بۆ پێگەیاندنی مرۆڤ! مرۆڤ ئەو بوونەوەرە ناسکەیە، کە خاوەنی ڕۆح و ئەقڵ و ویژدان و چەندین لایەنی ناسک و هەستیاری دیکەیە. مرۆڤ شکۆ و ڕێز و کەرامەتی هەیە، بۆیە چاوەڕێی ئەوەی لێ ناکرێت هەر وەک (سەگەکان) ئیرادەی خۆی بداتە دەست ئەوانەی شکۆی دەشکێنن و بوونی پێشێل دەکەن. نەک هەر ئەوەندە، بگرە دەچێتە سەنگەری بەرگری و شەڕی شکۆمەندی دەکات بەرامبەر ئەوانەی دەیانەوێت دەست بەسەر کەسێتی و ناسنامەیدا بگرن. بۆیە دەبینیت دەکەونە شەڕانگێزی و عینادی، هەتا زۆریشیان لێبکرێت بۆ ئەوەی ئاقڵ ببن، ئەوان زیاتر هار دەبن. ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکی سادە و ساکاری هەیە: پەروەردەی مرۆڤ لە ڕێگەی دواندنی ویژدانەوە دەبێت، نەوەک زۆر و زۆرکاری و سزادان.

ئێستا بە ئاوڕێک لە خۆمان بدەینەوە و پرسیارێکی دڵسۆزانە بکەین: چ دایکێک لە ئەنجامی بەکارهێنانی سزا و توندوتیژییەوە حەساوەتەوە؟ یان چ دایک و باوکێک ئاسوودەیە لەو هەرا و دەنگە دەنگەی دروست دەبێت، کاتێک منداڵان دەیانەوێت بەرگری لە شکۆی خۆیان بکەن؟

## هەر کات دایک هەستی بەو زیانە کرد، کە بە منداڵەکەی گەیاندووە...

هەتا ئەو کاتەی دایک واز لە ئاڕاستەکردن و لەقاڵبدانی منداڵەکەی نەهێنێت، ناتوانێـت بەتەواوەتـی بیناسـێت. بـۆچی؟ چـونکە ئەو شـتانەی دایـکەکە لە منداڵەکەیدا دەیبینێت، ئەو شتانە نـین کە لە سروشـتی ڕاسـتەقینە و فیترەتـی منداڵەکەوە سەریان هەڵداوە، بەڵکو ئەو گۆڕانکارییانە دەبینێت کە بە دەستی خۆی لە ناخی منداڵەکەیدا بەرپای کردووە. بە دەربڕینێکی تر؛ لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی نایبینێت، شوێنەوارەکانی خۆی دەبینێت لەسەر ئاوێنەی ڕۆحی. لەبەر ئەوە قسـەیەکی واقیعـی نییە، ئەو چەشـنە دایکـانە بڵـێن: "منـداڵەکەم دەناسم."

بەئاگاهـاتنەوەی دایـک هەنگـاوێکی باشـە، بەڵام بەس نیـیە بـۆ ناسینی ڕۆڵەکەی، چـونکە کۆڵەکـانی سەرشـانی نـاهێڵن وەک پێویسـت چێـژ لە دایکایەتییەکەی وەربگرێت.

هەنـدێك جـار لەتـاو کـۆڵە قورسـەکانی سەرشـانی، تەنهـا بژاردەیەکـی لەبەردەمدا دەمێنێتەوە؛ بەکارهێنانی هێز بـۆ کپکـردنەوەی جـووڵە و بزۆکیی منداڵەکەی. دەبێ ئەوەش بڵێین کە بەئاگاهاتنەوە و خۆڕۆشنبیرکردن، بەتەنها نابێتە مایەی دەستبەرداربوون لەو خووە ناتەندروستە. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئەو ئێستا لەژێر کاریگەریی ئەو پاڵنەرە نادیارانەی نەستیدا دایکایەتی دەکات، کە دایکی خۆی بەمنداڵی لە ڕۆحیدا دروستی کردووە.

ئەگەر دایکان بەوردی سەرنج بدەن، ئەوکات بۆیان دەردەکەوێت زۆرێک لەو شێوازانەی لەگەڵ منداڵەکانیان بەکاری دەهێنن، هەمان ئەو شێوازانەیە کە بەمیراتی لە دایکیانەوە بۆیان ماوەتەوە. سەیر نییە، چونکە ئەوانیش پەروەردەی

دەستی هەمان سیستمی پەروەردەیین؛ ڕەنجاندن، دەستەوسانکردن، پلیشاندنەوە و ڕێزلێنەگرتن.

خۆ ئەگەر سەرگوزەشتەی منداڵییەکەی بەو شێوەیە زبر و پڕ لە تابلۆی توندوتیژیش نەبوویێت، لانی کەم بۆی دەردەکەوێت کە چۆن ئالوودەی دایکی بووە و لەپێناو لەدەستنەدانی خۆشەویستییەکەیدا چۆن هەوڵی داوە (منداڵە سەلار و ئاقڵەکە) بێت و لەبری ئەوەی بۆ خۆی بژی، بۆ ئەوە ژیاوە دایکی دڵخۆش بکات و چاوەڕوانی و داخوازییەکانی ئەو پڕ بکاتەوە.

> **ئەگەر دایکان بەوردی سەرنج بدەن، ئەوکات بۆیان دەردەکەوێت زۆرێک لەو شێوازانەی لەگەڵ منداڵەکانیان بەکاری دەهێنن، هەمان ئەو شێوازانەیە کە بەمیراتی لە دایکیانەوە بۆیان ماوەتەوە.**

بە بڕوای ئێوە، پەیوەندیی نێوان ئەو منداڵەی کە دەڵێت: "من هەرگیز دایکم زویر نەکردووە"، لەگەڵ دایکیدا تا چەند تەندروستە؟ ئاخر چۆن دەبێت منداڵ بیت و دایکت زویر نەکردبێت؟ منداڵ منداڵە، منداڵیش دایکی زویر دەکات.

دایکەکە بە شێوەیەك ئیرادەی منداڵەکەی داگیر دەکات، وای لێ دێت دەبێت بە پسپۆڕ لە دەرککردن بە هەستەکانی دایکی. دایکەکە هێشتا ڕووی نەداوە بەیەکدا، ئەم یەکسەر لەولاوە حەزەکەی خۆی واز لێ دەهێنێت بەس بۆ ئەوەی دایکی بێتاقەت نەبێت، ئەوجا دەست دەکات بە چاودێریکردنی دایکی بزانێت دڵی باش بووەتەوە یان نا. ئەو جۆرە دایکانە بەگشتی چێژ لەم حاڵەتە وەردەگرن و وەک ئەوەی جێی شانازی بێت، لای خزم و دراوسێ باسی دەکەن: "بەخودا منداڵەکەم تا ئێستا دڵی نەشکاندووم." نازانێت کەسێتیی

منداڵەکەی زەوت کردووە، ئەو کەسەی ئەو خۆی پێوە هەڵدەکێشێت ڕۆبۆتێکە
کە لە سەنتەری هەستەکانییەوە ئاڕاستە دەکرێت.

من وەک خۆم لەوەها بارێکدا دەکەومە بیرکردنەوە: ئەو منداڵەی دەڵێ:
"بەمنداڵی قەت دڵی دایکم نەئێشاندووە"، تۆ بڵێی فێری ئەوە بوو بێت بە هەستەکانی دایکیەوە بژی! تۆ بڵێی قەت هەستی بە هەستەکانی خۆی کردبێت؟ یان تۆ بڵێی لە ترسی لەدەستدانی خۆشەویستیی دایکی، ئیرادەی خۆی ڕادەستی دایکی کردبێت؟ تۆ بڵێی ئەوەندە هەستیار بوو بێت کە لە ئاماژەی ڕووخسار و دەنگ و جووڵەی جەستەی دایکیەوە پەی بە هەستەکانی بردبێت و دایکەکەش بەمەی زانیبێت و وەک داردەستێک بەکاری هێنابێت؟

ئیتر هەر ئەوەندەی دەست دەکەین بە بیرکردنەوە لەم پرسیارانە، بۆمان دەردەکەوێت گەورەترین شت کە دایکانی ئێستا لە دایکیانەوە فێر بوون ئەوەیە، چۆن ویست و ئیرادە و حەزی منداڵەکەیان لەناو بەرن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، چونکە خۆیان لەناو مەسەلەکەدا بوون و بە چاوی خۆیان بینویانە، ئیتر چۆن نابنە پسپۆڕ تێیدا!

لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: ئەو کیژە گەنجەی ئەوە چیرۆکی منداڵییەکەیەتی، کە بوو بە دایک چۆن ئەو سووڕە داخراوە بشکێنێت و نەبێتە دیلی ڕابردووی؟ چۆن بتوانێت بە ڕۆحێکی تەندروستەوە دایکایەتی بکات، لە کاتێکدا ئەو لە جەستەی خۆیدا ڕۆحی دایکی هەڵگرتووە؟

ئەمەش بۆخۆی مەسەلەیەکی ترە، کە ناهێڵێت دایکان بەجوانی منداڵەکانیان بناسن. بێ ئەوەی پێی بزانێت، بە چاوی دایکی تەماشای منداڵەکانی دەکات. کاتێك منداڵ کارێك دەکات کە نەدەبوو بیکردایە، ئەوا بەگوێرەی ئەو شوێنەوارەی کە دایکی لە ڕۆحیدا جێی هێشتووە، منداڵەکە

(هاروهاجه). خۆ ئەگەر ئاقڵ و سەلاریش بێت، ئەوا دیسانەوە لەبەر ئەوەیە کە دایکی پێی وا بووە.

وەک پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، هەتا ئەو کاتەی دایک لە منداڵە ئالوودەبووەکەی دانەبڕێت و لەژێر سێبەری دەنگە ناوەکییەکانی دایکی لە ڕۆحیدا ڕزگاری نەبێت، ناتوانێت بە چاوێکی بابەتییانە منداڵەکەی ببینێت و تایبەتمەندییەکانی بدۆزێتەوە.

باشە با بڵێین ئەوەشی کرد، ئەی ئایا ئەوەندە بەسە؟ بێگومان نەخێر...

## ترس و دڵەڕاوکێی لەوەی "خەڵکی چی دەڵێن؟"

یەکێکی تر لەو هۆکارانەی دەبنە بەربەست لەبەردەم ئەوەی دایکان منداڵەکانیان بناسن، ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی دایکەکەیە؛ خزم و کەوسوکار و دراوسێ. کاریگەریی ئەم لایەنە هێندە بەهێزە، دایکەکە ئەوەی پێ باشترە قسەی نەیەتە سەر "ئەمان شتێک بە منداڵەکەم نەڵێن"، وەک لەوەی بە شێوەیەکی سروشتی و وەک ئەوەی لە دڵیەوە دێت لەگەڵ جگەرگۆشەکەیدا بجووڵێتەوە.

با وا دابنێین بۆ میوانداری دەچنە ماڵی هاوڕێیەکی، کە کەلوپەلی ناو ماڵەکەی زۆر خۆش دەوێت. لە ترسی ئەوەی منداڵەکەی شتێک نەشکێنێت، دەکەوێتە پاسەوانی. یان لە ڕێستۆرانت و شوێنە گشتییەکان منداڵەکە هەر ڕەفتارێکی منداڵانە بنوێنێت، ئەوان تەریق دەبنەوە و هەست بە شەرمەزاری دەکەن.

بۆیە پێمان وایە زەحمەتە لەژێر فشاری کۆمەڵایەتیدا بیت و بتوانی ئاشنای ڕۆحی منداڵەکەت بیت، چونکە یان خەریکی پاسەوانیت، یان بەردەوام لە تەریقبوونەوەدایت لە هەڵسوکەوتی منداڵەکەت.

## "ئێ خۆ ئەو خەڵکە هەمووی بەهەڵەدا نەچووە!"

یەکێکی تر لە ڕەنگدانەوەکانی فشاری کۆمەڵگە ئەوەیە، دایکەکە بۆ هەر لایەک بڕوانێت، چاوی بە شێوازی پەروەردەیی ناتەندروست دەکەوێت. ئیتر بەوجۆرە گومانی بۆ دروست دەبێت: "تۆ بڵێی ئەو خەڵکە هەمووی لەسەر هەڵە بێت!" و چاوی لە بینینی هەڵەکانی خۆی کەلا دەبێت.

> دایکەکە ئەوەی پێ باشترە قسەی نەیەتە سەر "ئەمان شتێک بە منداڵەکەم نەڵێن"، وەک لەوەی بە شێوەیەکی سروشی و وەک ئەوەی لە دڵیەوە دێت لەگەڵ جگەرگۆشەکەیدا بجووڵێتەوە.

بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، ئێمە لە ژینگەیەکی ناتەندروستداین و ژمارەی ئەو دایک و باوکانە زۆر کەمە کە مامەڵەی پەروەردەییانە لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن.

زەحمەت بکێشن ئاوڕێک بدەنەوە بەلای ماڵی دراوسێکەتاندا، بزانن چۆن لەگەڵ منداڵەکەیاندا دەجووڵێنەوە کاتێک بەقسەیان ناکات. بزانن چۆن پەلی ئەو منداڵانە دەگیرێت، کە هەڵە دەکەن و دەخرێنە ژوورێکەوە، پاشانیش ناچار دەکرێن پۆزش بهێننەوە. ئەوجا بۆی بڕوانن کاتێک بەڵێنی لێ وەردەگیرێت کارەکەی دووبارە نەکاتەوە، چۆن شکۆی زامدار دەکرێت.

ئەو دایکەی بە زەبری هێز و بازوو منداڵەکەی ژێر کردووە و شێوازگەلێک بەکار دەهێنێت کە ئیرادەی منداڵەکەی ژێرپێ دەخات، کێ دەتوانێت لەمڕۆدا پێی بڵێ: "بۆ خاتری خودا، ئەرێ تۆ خەریکی چیت؟"

**بەداخەوە، ئەمڕۆ لە هەموو سووچێکی ژیاندا؛ ماڵ، کۆڵان، قوتابخانە ڕێمان لەو شێوازانە دەکەوێت، کەسێکیش نییە قسەیەکی خێری تێدا بکات.**

ئەوەتا منداڵ ئەرکی ماڵەوەی ناکات، مامۆستا ڕووی خۆی لێ گرژ دەکات، کەمێک قسەی باوکی دوا دەخات، دەکەوێتە بەر ڕەحمەتی لێدان، شتێک بەقسەی دایکی ناکات، هاتوهاواری بەسەردا دەکرێت و دەستوپێی ویست و ئیرادەی دەبەسترێتەوە.

## منی ڕاستەقینە، منی ساختە

گەورەترین چاکەی دایک لەگەڵ منداڵەکانی ئەوە نییە سروشتیان بگۆڕێت و ئالوودەیان بکات بە خۆیەوە و مرۆڤێکی دەستکردیان لێ بەرهەم بهێنێت. تەواو پێچەوانە، گەورەترین چاکە ئەوەیە زەمینەیان بۆ بڕەخسێنێت خۆیان چۆنن ئاوەها گەورە ببن.

منداڵ تەنیا کاتێک دەتوانێت کەسێتیی ڕاستەقینەی خۆی بنیات بنێت، کە دایک و باوکی وەک خۆی قبوڵیان کردبێت و هاودەمیی هەستەکانیان کردبێت (ڕێگەیان داوە هەستەکانی دەرببڕێت و تەریقیان نەکردووەتەوە). بۆیە وا دەڵێم، چونکە ئەو منداڵانەی خراپ مامەڵەیان لەگەڵ کراوە، هەر لەو تەمەنەوە فێری ئەوە دەبن خۆیان بە ڕووی کۆمەڵە هەستێکدا دابخەن.

ئەگەر هاتوو منداڵ خاوەنی دایک و باوکێک نەبوو کە ڕێزیان لە کەسێتییەکەی گرتبێت و نەیدەتوانی بەئاسانی گوزارشت لە هەستەکانی بکات لەلایاندا، لەو حاڵەتەدا ناچارە لەگەڵ هەستەکانیدا نەژی، بەڵکو بۆ ڕازیکردنی دەورووبەری بژی، نەبادا ئەو خۆشەویستییەی لەدەست بچێت کە داویانەتی.

> **گەورەترین چاکەی دایک و باوک لەگەڵ منداڵەکانیان ئەوەیە، زەمینەیان بۆ بڕەخسێنن خۆیان چۆنن ئاوەها گەورە ببن.**

کاتێك منداڵ فێری ئەوە دەبێت بەگوێرەی ویست و ڕەزامەندیی کەسانی تر بجوولێتەوە، ئەوا بەسەرکەوتوویی یەکەم هەنگاوی دروستکردنی (کەسێتیی ساختە)ی ناوە. گرفتی دەروونی و سەرکەشیش دوا مەنزڵی ئەو منداڵانەیە، کە لەژێر سێبەری کەسێکی تردا پێدەگەن و ناتوانن گوزارشت لە خۆیان و پێداویستییەکانیان بکەن.

هەر ئەم خاڵەیە وای لە بەشێک لە پسپۆڕان کردووە، هەوڵی خۆیان لەوەدا چڕ بکەنەوە کە کەسەکان بەو (منە ڕاستەقینەیە) شاد بکەنەوە، کە لە منداڵیدا لەدەستیان داوە.

کە منداڵ هەستی کرد ڕۆحی لەژێر هەڕەشەدایە و سووکایەتی و ڕەخنەبازی چڕنووکیان بۆ کەسێتییەکەی تیژ کردووەتەوە، هاوشێوەی کیسەڵ کە دەچێتەوە قاوغەکەی خۆی، ئەویش بەو شێوەیە دەچێتەوە ناو ناخی خۆی و خۆی بە ڕووی جیهانی دەرەوەدا دادەخات. ئەم (خۆشاردنەوەیە)ی منداڵ دەبێتە بەربەست لەوەی دایکی کەشفی بکات. ئەو کیسەڵە چۆن دەبینین کە چووەتەوە ناو قاوغەکەی خۆی؟ وەک بەرد، وا نییە! دەی ئەو دایکەش تەنها ڕووکەشی دەرەوەی منداڵەکەی دەبینێت، بۆیە هەرگیز پێشبینییەکانی ناپێکێت.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەو دایکانەی خوازیاری ناسین و کەشفکردنی دنیای ڕازئامێزی منداڵەکانیانن، دەبێ ئاگادار بن لەو کاتانەدا نەیانشکێننەوە کە ناسنامە و کەسێتیی ڕاستەقینەی خۆیان دەردەخەن، چونکە بە شکاندنەوە و زویرکردن و تەریقکردنەوە دەچنەوە ناو قاوغەکەیان.

# قۆناغی منداڵی تەمەنی (٠-٧)ساڵی



قۆناغی منداڵی، ماوەی نێوان هـاتنە دنیـای منـداڵە تـا دەگـاتە ٧ سـاڵی. ئەم قۆناغەش لەناو خۆیدا دەکرێت بە دوو بەشەوە: (٠-٤) ساڵی و (٤-٧) ساڵی.

## هێزی منداڵانی تەمەن (٠-٤) ساڵی

دەتوانین بڵێین قۆناغی (٠-٤) ساڵی، گرنگترین قۆناغی گەشەی منداڵە. بناغەی ڕۆح و کەسـێتیی مـرۆڤ لەم قۆنـاغەدا بنیـات دەنرێـت. ئەمە جـگە لەوەی هەلێکی تاقانەیە و تەنها یەک جار دەتوانین تیایدا بژین.

ئەگەر هاتوو نەمامێکی بچووک کەمێك بڕوشێنین، کاتێک گەورە دەبێـت و دەبێـت بە دارچنـارێکی مەزن، دەبینـین شـوێنەوارەکەی بـووە بە درزێکـی گەورە. هاوشێوەی ئەوە، ڕووشاوی و برینەکانی منداڵی، لە گەورەییدا لەسەر شێوەی چەندین گرفت و ئاڵۆزیی دەروونـی دێـنە بەردەمـمان. ئەگەر بیرتـان بێت لە بەشی پێشوودا باسـمان لەوە کـرد، چۆن ئازار و برینە دەروونییەکانی منـداڵی ناهێڵن دایکان چێژ لە دایکایەتی وەربگرن. دەی ئەگەر لە (٠-٤)ساڵیدا ڕۆحی منداڵ ئازاری پێگەیشتوو و تەندروستانە مامەڵەی لەگەڵ نەکـرا، کاتێـک ئەو منـداڵە گەورە دەبێت و دەبێت بە دایـک، گیـر دەخـوات

> **ڕووشاوی و خەتە باریکەکانی منداڵی، لە گەورەییدا لەسەر شێوەی چەندین گرفت و ئاڵۆزیی دەروونی دێنە بەردەممان.**

بەدەست هەستە ناخۆشەکانی نەستیەوە. بۆیە زۆر گرنگە دایکان بەو چاوەوە بڕواننە ئەم قۆنـاغە و چییـان لەدەسـت دێـت بـیکەن، بـۆ ئەوەی بـێ هـیچ ڕووشاوی و لەکەیەك بەسەلامەتی تێبپەڕێت.

پرسیارەکە ئەمەیە: دایکان چی بکەن بۆ ئەوەی ئەم قۆنـاغە بەتەندروستی تێبپەڕێت؟

## تەنها دایکایەتییەکی سروشتی بکە!

لە ڕاستیدا وەڵامـی ئەم پرسـیارە ڕوون و سـانایە، چـونکە سەرپەرشـتیکردنی منـداڵی ئەو تەمەنە کـارامەیی تـایبەتی ناوێـت، دایکـایەتیی سروشـتی بەسـە. هۆکارەکەشی ئەوەیە، منـداڵ لەو تەمەنەدا هێـزی فێربـوونی نـاو ڕۆحـی خۆی بەکار دەهێنێت بۆ پەیبردن بە شتەکان و پەیوەندیی نێوان ڕووداوەکان.

خـۆی دیـاری دەکـات، چـی و بە چ شـێوەیەک فێـر ببێـت. ئەگەر دایکـان خوازیارن منداڵەکانیان لە ڕووی ڕۆحییەوە ساز و سـاغ بـن، پێویسـتە لەسـەریان نەبـنە ڕێگـر لەو ویسـتی فێربـوونەی کە لە نـاخی جگەرگۆشـەکانیانەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام بەداخەوە زۆرێـک لە شـێوازەکانی پەروەردەی منداڵ گرنگـی نـادەن بەم لایەنە. دایکـانیش ئەو حەز و خولیـا بەرپێنەگیـراوەی کۆرپەکانیـان نـابینن، زیـاد لەوە، بە وڕکگـرتن و زیـاد بەدەمەوەدان ناوزەنـدی دەکەن.

لەکاتێکـدا لەو مـاوەیەدا (٠-٤) سـاڵی، بە حەز و شـەوقێکی بێشـوماری فێربوونەوە بەرەو ئامـانجەکەی دەڕوات. ئەم ویسـتی فێربـوونە ئەوەنـدە بەهێزە، هەموو ئاستەنگەکانی بەردەمی لا دەبات، جا بە گریان بـێ یـان بە خۆکێشـان بە زەوی و سەرکوتان بە دیواردا...

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەم قۆناغە پڕ نهێنییەی منـداڵی، دەتـوانین پـێکەوە لەم نموونەیە ڕابمێنین:

**ئەرکی سەرەکیی منداڵ لە ماوەی چوار ساڵی سەرەتای تەمەنیدا بریتییە لە: لێکۆڵینەوە لەو ژینگەیەی تێیدا دەژی، ناسینی مرۆڤەکان، فێربوونی ئاخاوتن و پەرچەکردارەکان و چۆنێتیی هەڵسوکەوتکردن، لەگەڵ ناسینی شتەکانی دەوروبەر و پەیبردن بە پەیوەندی نێوان شتەکان و ڕووداوەکان.**

با وا دابنێین لە پێشـبڕکێی دەرهێنانی ئاڵتووندایین لەنـاو چاڵێـــــک، دەبێــــــت بەشـــداربووان لە مـــاوەی چوار خولەکـدا ئاڵتوونەکـان دەربهێـــنن، هەرچـــیش دەربهێـــنن، دەبێـــتە هـــی خۆیـان. ئەگەر سـەرکەوتوو بــــن لە دەرهێنــــــانی ئاڵتوونەکانـــــدا، وەک ئەوە وایە ژیان بەدەمیانەوە پێکەنیبێت و دەرگاکانی بەختەوەریـی بە ڕوودا کـردبێتنەوە. ئەو بەشـداربووانەی ئەو چـوار خـولەکە بەباشـی دەقـۆزنەوە، دەبـنە خـاوەنی سەروەتێکی مەزەنـدەنەکراو. بەڵام ئەگەر نەیـانتوانی سـوود لەو چـوار خـولەکە وەربگرن، ئەوا باقیی تەمەنیان لەنێو هەژاری و دەردەسەریدا بەسەر دەبەن.

ئەگەر لەو کـاتەدا بچیـتە لای یەکێـک لە بەشـداربووەکان و پێـی بڵێـی: "چەندە بەشداربوویەکی جوان و پێکەوتەیت!" یان پێشنیاری بۆ بکەین، "وەرە بەقسەی من بکە، مەچۆرە ناو ئەم چاڵەوە، من دانەیەکی باشتر شـک دەبەم!" کە لە ڕاستیدا شتی وەهاش بوونی نییە. لەبەرامبەر ئەم ڕێگرییانەی تۆدا، داخۆ دەبێت هەڵوێستی ئەو بەشداربووە چۆن بێت؟ بڕوا ناکەم بە جوانی و ناسکی مامەڵەت لەگەڵ بکات. زیاد لەوە، هەوڵ دەدات لەکۆڵی ببیتەوە و لە ڕقی تۆ بچێتە ناو چاڵەکەی یەکەم جارەوە.

بەڵام ئەگەر تۆ هەر پێداگریت کرد و سوور بوویت لەسەر ئەوەی گوێڕایەڵیت بکات، لەو پێناوەشدا قۆڵیت ڕاکێشا و بەزۆر پەلکێشت کرد، ئەوسا چی؟ ئەی ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانتانەوە؟

بێگومان هەڵوێستی بەشداربووەکە بەدەر نابێت لە تووڕەیی و کەللەڕەقی.

ئەگەر لە کڵاوڕۆژنەی بابەتەکەمانەوە بڕوانینە نموونەکە: بەشداربووی ناو پێشبڕکێکە بریتییە لە منداڵی تەمەن (٠-٤) ساڵ، چوار خولەکەکەش هاوتای ئەو چوار ساڵەیە. ئەرکی بەشداربووەکە ئەوەیە لە ماوەی ئەو چوار خولەکەدا بچێتە ناو چاڵەکەوە و ئاڵتوونەکان دەربهێنێت، ئەوجا بۆخۆی پاشماوەی ژیانی لە خۆشگوزەرانیدا بەسەر بەرێت. ئەرکی سەرەکیی منداڵیش لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا بریتییە لە: لێکۆڵینەوە لەو ژینگەیەی تیایدا دەژی، ناسینی مرۆڤەکان، فێربوونی ئاخاوتن و پەرچەکردارەکان و چۆنێتیی هەڵسوکەوتکردن، لەگەڵ ناسینی شتەکانی دەوروبەر و پەیبردن بە پەیوەندیی نێوان شتەکان و ڕووداوەکان. لە هەمووشی گرنگتر، پاڵفتەکردنی ڕۆحە لە هەموو جۆرە ترس و تۆقینێک، تاکو بتوانێت بەدڵنیایی هەنگاو بنێت، دەنا تەواوی ژیانی بەدەست نەبوونی ئەو شتانەوە گیر دەخوات.

منداڵان لەم تەمەندا بەتەواوەتی سەرنجیان لەسەر پرۆسەی فێربوونە. کەواتە دایکان چی بکەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە هیچ نەکەن، ئەوە نەبێت زەمینەی فێربوونی بۆ خۆش بکەن و بەردەمی واڵا بکەن.

با سەرنجێک لە قۆناغی گاگۆڵکێ بدەین: دایکێک بەبەر چاوی منداڵەکەیەوە دەرگای یەکێک لە چەکمەجەکان دەکاتەوە و شتێکی لێ دەردەهێنێت، پاشان دایدەخاتەوە. منداڵەکەش ئەم جووڵەیەی دایکی دەبینێت، شتێکی زۆر سەیرە بەلایەوە. ئەو دیوارە بێ جووڵەیە کە لە جێی خۆیدا وەستابوو، بە جووڵەیەکی دایکی هاتە پێشەوە!

ئەریٚ ئەوە چی بوو؟ ئەو (شتە) چی بوو کە لە دیـوارەکەوە هـاتە دەرەوە؟ دەیەویٚت بزانێت چی گوزەرا، ناچارە فێر ببێـت. بەبەی سـاوا لەبەرامـبەر ئەم زانیارییە نوێیەدا، هەر وەک بەشداربووی پێشبڕکێکە تەواوی سـەرنجی دەداتە ئامانجەکەی، هەوڵ دەدات شتێکی نویٚ لە ژیانیـدا کەشـف بکـات، ناچـارە ئاڵتوونەکە بدۆزێتەوە.

## ڕۆحی تەنگ دەبێت

ڕێک لەو ساتەوەختەدا کە خەریکە بەقنەخشکیٚ بەرەو چەکمەجەکە دەڕوات، دایکی چاوی پـیٚ دەکەویـت و دووری دەخـاتەوە، بە دەستیشـی ئامـاژەی بـۆ دەکات: "بڤڤڤە، نەکەی!" بەڵام ئەو ناچارە بە ئەرکی خـۆی هەسـتێت. چـی کردووە! دەبێت بچێتە ناو چاڵەکەوە و ئاڵتوونەکـان دەربهێنێـت، واتە دەبێـت ئەو گرێکـوێرەیە بکـاتەوە، ئەگینـا پرۆسـەی فێربـوونەکەی تەگەرەی تـیٚ دەکەوێت. بۆیە جارێکی تـر هەڵـمەت دەبـاتەوە، بەڵام چـی لە چـاوی دایـک دەرەچێت! دەیخاتەوە باوەشی: "کـۆرپە شـیرینەکەی دایە، وەرە قوربـانی بـم مەچۆ بۆ ئەویٚ، وەرە تۆ بزانە چیم بۆ کڕیویت، بۆخۆت بەمـانە یـاری بـکە." بەڵام ئەو سوورە لەسەر گەیشتن بە ئامانجەکەی، بۆیە خۆی ڕادەپسکێنێت و دەیەوێـت لە باوەشـی دایکـی بێـتە خـواریٚ. بەڵام ئەم جـارە ڕووبەڕووی بەرهەڵستی زیاتری دایکی دەبێتەوە. هەتا ئەم پێداگری بکات، دایکـی زیـاتر توورە دەبێت. بە تووڕەبوونی دایکی، ئەمیش زیاتر دەکەوێت بە ڕقدا. ئەمجـا دەکەوێتە شینوشـەپۆڕ، بەڵام دایکـی زیـاتر ڕێـگەی لـیٚ دەگرێـت، چـونکە بێخەبەرە لەوەی کە لە ڕۆحی منداڵەکەیدا دەگوزەرێت.

ئەو دایکەی هەست بە تەنگیی ڕۆحی منداڵەکەی ناکات، دەچێت سـەرنجی منداڵەکەی بۆ لای شتێکی دیکە ڕادەکێشێت. بەڵام ئەو هەر کۆڵ نـادات، تـا

ئەریٚ ئەوە چی بوو؟ ئەو (شتە) چی بوو کە لە دیـوارەکەوە هـاتە دەرەوە؟ دەیەوێت بزانێت چی گوزەرا، ناچارە فێر ببێـت. بەبەی سـاوا لەبەرامـبەر ئەم زانیاریە نوێیەدا، هەر وەک بەشداربووی پێشبڕکێکە تەواوی سـەرنجی دەداتە ئامانجەکەی، هەوڵ دەدات شتێکی نویٚ لە ژیانیـدا کەشـف بکـات، ناچـارە ئاڵتوونەکە بدۆزێتەوە.

## ڕۆحی تەنگ دەبێت

ڕێک لەو ساتەوەختەدا کە خەریکە بەقنەخشکیٚ بەرەو چەکمەجەکە دەڕوات، دایکی چاوی پـیٚ دەکەوێـت و دووری دەخـاتەوە، بە دەستیشـی ئامـاژەی بـۆ دەکات: "بڤڤڤە، نەکەی!" بەڵام ئەو ناچارە بە ئەرکی خـۆی هەسـتێت. چـی کردووە! دەبێت بچێتە ناو چاڵەکەوە و ئاڵتوونەکـان دەربهێنێـت، واتە دەبێـت ئەو گرێکـوێرەیە بکـاتەوە، ئەگینـا پرۆسـەی فێربـوونەکەی تەگەرەی تـیٚ دەکەوێت. بۆیە جارێکی تـر هەڵـمەت دەبـاتەوە، بەڵام چـی لە چـاوی دایـک دەرەچێت! دەیخاتەوە باوەشی: "کـۆرپە شـیرینەکەی دایە، وەرە قوربـانی بـم مەچۆ بۆ ئەویٚ، وەرە تۆ بزانە چیم بۆ کڕیویت، بۆخۆت بەمـانە یـاری بـکە." بەڵام ئەو سوورە لەسەر گەیشتن بە ئامانجەکەی، بۆیە خۆی ڕادەپسکێنێت و دەیەوێـت لە باوەشـی دایکـی بێـتە خـواریٚ. بەڵام ئەم جـارە ڕووبەڕووی بەرهەڵستی زیاتری دایکی دەبێتەوە. هەتا ئەم پێداگری بکات، دایکـی زیـاتر توورە دەبێت. بە توورەبوونی دایکی، ئەمیش زیاتر دەکەوێت بە ڕقدا. ئەمجـا دەکەوێتە شینوشـەپۆڕ، بەڵام دایکـی زیـاتر ڕێـگەی لـیٚ دەگرێـت، چـونکە بێخەبەرە لەوەی کە لە ڕۆحی منداڵەکەیدا دەگوزەرێت.

ئەو دایکەی هەست بە تەنگیی ڕۆحی منداڵەکەی ناکات، دەچێت سـەرنجی منداڵەکەی بۆ لای شتێکی دیکە ڕادەکێشێت. بەڵام ئەو هەر کۆڵ نـادات، تـا

ئەوەی دوا جار ڕادەستی ئەو جووڵە و هەڵسوکەوتە نامۆیانە دەبێت کە دایک دەیکات بۆ ئەوەی بیخافڵێنێت و ئامانجەکەی لەبیر بەرێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەو دایکانە هیچ بیر لەوە ناکەنەوە، بەم هەڵسوکەوتەیان ڕێیان خۆش کردووە منداڵەکەیان لە ئایندەدا بیرپەرت و کەمسەرنج دەربچێت.

بەڵێ، لە سەرەکیترین هۆکارەکانی ئەو بیرپەرتی و سەرنجپەرشییەی لەناو منداڵانی ئەمڕۆدا باوە، ئەوەیە کاتێک بە خولیای فێربوون و کەشفکردنەوە بەرەو شتێک دەچن، دایک و باوک بەریان پێ دەگرن و دووریان دەخەنەوە، یان سەرنجیان بۆ لای ئەو جووڵە و یارییانە ڕادەکێشن کە بۆ لەبیربردنەوەیان ئەنجامی دەدەن.

دەتوانین نموونەکان زیاتر بکەین: ئەی مەگەر ئەوە پەکخستنی خواستی ڕۆحیی منداڵ نییە، کە بەرەو شتێك گاگۆڵکێ دەکات، بە دەنگێك یان پێداکێشانێك لە پشتەوە ڕایدەچڵەکێنیت و دەیخەیتە باوەشت؟ چی دەبێت، ئەگەر ڕێز بۆ سەرقاڵییەکەی دابنێین!

وەک دەبینن، هەستیاریی ئەم قۆناغە ئا بەو جۆرەیە. ڕۆڵی دایک تا بڵێی گرنگە، گرنگترین ئەرکیشی بریتییە لەوەی لەکاتی خۆیدا بچێت بەدەم پێداویستییەکانیەوە و ئاستەنگ دروست نەکات لەبەردەم پرۆسەی فێربوونیدا.

## پێداویستییەکانی منداڵ، دەبێت لە کاتی خۆیدا پڕ بکرێنەوە

پێداویستییەکانی منداڵی تەمەن (٠-٤)ساڵی، هی ئەوە نییە دوا بخرێت. بەتایبەت منداڵانی تەمەن (٠-٢)، تووشی ترس و تۆقین دەبن ئەگەر لە کاتی

خۆیدا بەدەم پێداویستییەکانیانەوە نەچێت. دەتوانین بەم جۆرەی لای خوارەوە بڕوانینە بابەتەکە:

چۆن مرۆڤێک هەست بە نامۆیی دەکات ئەگەر کتوپڕ لەسەر هەسارەی مەریخ خۆی ببینێتەوە، ئاوەهاش منداڵ هەست بە نامۆیی دەکات کە دێتە دنیاوە. ئەگەر لەسەر مەریخ چاوی بە کۆمەڵە بوونەوەرێکی ئاسمانی بکەوێت کە قاچیان لە سەریاندایە و چاویان لە ئەژنۆیاندایە، گومانی تێدا نییە کە تووشی جۆرێک لە ترس و سەرسامی دەبێت، کۆرپەی تازەلەدایکبووش هەمان هەستی هەیە. چاوی بە کەسانێک دەکەوێت، کە لەلای سەریانەوە دوو شت هاتووەتە دەرەوە (بەستەزمانە چۆن بزانێت ئەوە گوێچکەیە!) و... هتد. هەموو ئەو ڕاستییانە بۆ ئەو، جگە لە کۆمەڵە دیاردەیەکی نامۆ هیچی دی نین. بەڕای ئێوە مافی خۆی نییە بترسێت و هەست بە حەپەسان بکات؟

> **ئەو منداڵانەی پیداویستییەکانیان لە کاتی خۆی و بە بڕی پێویست پڕ دەکرێتەوە، لە ناخەوە هەست بە دڵنیایی و ئارامی دەکەن.**

گرنگیی دایک لێرەوە دەردەکەوێت، چونکە ڕۆڵی ئەو پەناگە ئارامە دەبینێت کە منداڵ لەبەرامبەر ئەو هەموو ئاڵۆزییەدا پەنای بۆ دەبات. ئیتر چۆن هەست بە ئاسوودەی و دڵنیایی نەکات، لە کاتێکدا لەگەڵ ترسانیدا یەکێک بەسۆزەوە لەئامێزی دەگرێت و خەمڕەوێنی دەکات، کە تینوو یان برسی بوو، یەکێک خەمی دەخوات.

بەڵام ئەگەر بە بیانووی ئەوەی "با ڕابێت بەتەنیا بخەوێت"، خرایە ژوورێکەوە و دایکی نەچوو بەدەمیەوە، گوایە "خۆی ڕایەت بە جەوەکە"، کە چاوی دەکردەوە جگە لە تاریکی هیچی تری نەدەبینی، بۆیە لە ترسا یەکسەر

دایدەخستەوە. یان لە کاتێکدا کە پێویستی بە باوەشی دایکیەتی، بەس لەبەر ئەوەی "با فێری باوەش نەبێت!" دایکی ئامێزی بۆ نەدەکردەوە، یان کە لە رووی سۆزەوە لەوپەڕی پێویستیدایە بە دایکی، ئەو بە بیانووی ئیشوکارەوە فەرامۆشی دەکرد، لەم حاڵەتانەدا ترس و دوودڵی ڕۆحی دەتەنێت و ئەم قەناعەتەی لای دروست دەبێت: "کەواتە ئەم شوێنە تازەیەی من بۆی هاتووم، شوێنێکی ئارام و دڵنیاییبەخش نییە، بەو پێیەش کە نایەن بەدەممەوە، کەواتە من شتێک نیم شایانی خۆشەویستی و گرنگیپێدان بم."

هەر بۆیە دەڵێین لەم قۆناغە هەستیارەدا پێویست ناکات دایک شتێکی ئەوتۆ بکات، ئەوەندە بەسە ڕێگە بە ڕێبەرە سروشتییەکەی ناخی بدات ئاراستەی بکات و خۆی بەو تێگەیشتنە چەوتانەوە سەرقاڵ نەکات کە دەڵێن: "با خووم پێوە نەگرێت، با پێم فێر نەبێت". لەبری ئەو ئەوانە، کار لەسەر ئەوە بکات چۆن هەست بە پێداویستییەکانی منداڵەکەی بکات و بەدەم خۆشەویستییەوە پڕیان بکاتەوە، بەڵام سەرەتا پێویستە بزانێت ئەو پێداویستییانە چین.

## منداڵ پێویستی بە چەشتنی هەستی دڵنیاییە

گەورەترین پێداویستی ئەم قۆناغەی منداڵ هەستکردنە بە دڵنیایی، بە ئارامی، بە دڵنەوایی. ئاخر ئەو پێی ناوەتە دنیایەکەوە، کە بەتەواوی مانا نامۆیە بەو. سەرچاوەی دەستەبەرکردنی ئەو هەستانەش بێ هیچ گومانێک، دایکە. جا وەرە لێرەوە بڕوانە ئەو ئاتاجییەی کە منداڵ هەیەتی بۆ دایک.

> **منداڵ کە دێتە دنیاوە، پێویستی بەوەیە هەست بە دڵنیایی و دڵدانەوە بکات.**

بەڵێ وایە، چوار ساڵی سەرەتای تەمەن بەردی بناغەی بنیاتنانی کەسایەتییە. بۆیە گەورەترین چاکەی دایک لەگەڵ ڕۆڵەکەیدا

ئەوەیە، بە درێژایــی ئەم قۆنــاغە لەگەڵــی بێــت و بەدەم پێداویسـتییەکانیەوە بچێت. دەنا ئەو منـداڵە لە گەورەییـدا نە بەرامـبەر خـۆی هەسـتی مـتمانە و دڵنیایی دەبێت، نە بەرامـبەر دەوروبەرەکەشــی. ئەو چەشـنە کەسـانە زۆربەی کات بەم جۆرە گوزارشت لە فەلسەفەی ژیانیان دەکەن: "لە ژیاندا متمانەت بە باوکیشت نەبێت." ئای ئەگەر دایکان دەیانزانی نەبـوونی ئەم هەسـتە لەسـەر ڕۆح چەندە قورس و گرانە!

کەسەکە گەورە دەبێت و دەبێت بە هاوسەر، لە ڕووکەشـدا هەمـوو شـتێک لە جێی خۆیـدایە. بەڵام دەبینــی لە نــاخەوە هەسـت بە دڵنیـایی ناکـات بەرامـبەر هاوسەرەکەی و متمانەی پێ ناکات. ئەوەتـا ناتوانێـت نـاخی بـۆ هاوبەشـەکەی ژیانی بکاتەوە، ئەوەتا دەڵێ: "لەکەیەوە پیاو متمانەی پێ کراوە! کـورە ئەمە دنیـایە با من خەمێکی خۆم بخۆم." یەکێ نەزانێ دەڵێی هاکا لە یەکتر جیا بوونەوە.

قسەمان لەسەر ئەوە نییە مـرۆڤ بیـر لە داهـاتووی بکـاتەوە و بە بەرنـامە هەنگـاو بنێـت، قسـەکە ئەوەیە ئەوانەی لە منداڵیـدا لە هەسـتی دڵنیـایی تێـر نەبوون، کە پێدەگەن و گەورە دەبـن، بەردەوام لە دڵەڕاوکێـدا دەبـن، بەردەوام چاوەڕێن شتێکی ناخۆش ڕوو بدات. ئەمە هەمان ئەو هەسـتانەن کە کاتێـك دایکی جێی دەهێشت، بۆی دروست دەبوو.

با ئەوەش بڵێین کە ئامـادەیی دایـک لەو چـوار سـاڵەدا مانـای ئەوە نیـیە هەموو شتێک تەواوە، چونکە ئامادەیی جەسـتەیی بەبـێ ئامـادەیی ڕۆحـی، دیسانەوە سەر دەکێشێت بۆ هەستنەکردن بە دڵنیایی. وەک چی؟ وەک ئەوەی دایکەکە لای منداڵەکەیەتی، بەڵام منداڵەکەی ئەمانەتی تەلەڤزیـۆن کـردووە، یان هیچ لێکەوتنێک لەنێوانیاندا نییە.

> ئەوانەی لە منداڵیدا لە هەستی دڵنیایی تێر نەبوون، کە پێدەگەن و گەورە دەبن، بەردەوام لە دڵەڕاوکێدا دەبن، بەردەوام چاوەڕێن شتێکی ناخۆش ڕوو بدات.

دەبینــی لەتــاو مانــدوویێتی و ئیشــوکار، دایــکەکە دەرفەتــی ئەوەی نییە لەگەڵ ڕۆحی منداڵەکەیدا ئـاوێتە بێـــت. خەریکـــی ئامـــادەکردنی خــواردنە، منــداڵەکە دێــت بــۆ لای، بەڵام ئەو پێــی دەڵــێ: "جــارێ ئیشــم هەیە، ئێســتا بچــۆ دەرەوە." میوانیــان دێت، بەس لەبەر ئەوەی ماڵەکە پـیس نەکــات، لە ژوورێکــدا تونــدی دەکەن. لەبەر ئەوەی فێــری نــازکردن نەبێــت، دایکەکە خۆی لــێ بەدوور دەگرێــت و لە ڕووی خۆشەویســتییەوە دەســتنوقاوانە مامەڵە دەکات. جــا ئیــتر پێکەوەیــی و ئامــادەبوونێکی جەســتەیی لەو جۆرە، چ سوودێکی هەیە!

وای بۆ دەچم ناخۆشترین شت بۆ منداڵ ئەوە بێــت، لەپــاڵ دایکیــدا بێت و لە ڕووی سۆزدارییەوە پێی نەگات، لەپاڵ دایکیدا بێت و نەتوانێت بە کــامی دڵی خۆی بنوێنێت و ئازادانە خواستەکانی دەرببڕێت. ترس، فشــار، فەرامۆشــکردن، ئەو سێ هۆکارەن کە ناهێڵن منداڵ بەدڵی خۆی چێژ لە دایکی ببینێت.

## سەبارەت بەو دایکانەی کار دەکەن

ئەو دایکانەی دەوامیان هەیە، کاتێک ئەم دێڕانە دەخوێننەوە ڕەنگە کۆمەڵە پرسیارێکیان بۆ دروست ببێت. ژیانی هاوچەرخ وای لێ هــاتووە دایکــانیش بچنە دەرەوە و هاوشانی پیاوان بەشدار بن لە دەستەبەرکردنی بژێویی ژیانیاندا. لە ئەنجامیشدا ناچار دەبن کۆرپە چەند مانگییەکانیان جێ بهێڵن و بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان.

لەو بـاوەڕەدام ئێـوەش پێشـبینیی بـاری دەروونیـی ئەو دایـکە دەکەن، کە ناچارە لە کۆرپەکەی جیا ببێتەوە و بچێتە دنیای دەرەوە. سروشتی دایک وایە، لە دووریی جگەرگۆشەکەی ویژدانی ئاسـوودە نابێـت. ڕاسـتە بە جەسـتە لە ئیشە، بەڵام بە ڕۆح ئەوەتا لەپاڵ کۆرپەکەیدا، ئاسوودە نابێت تا چەند جارێک تەلەفۆن نەکات و گوێی لە دەنگی نەبێت.

بەڵێ، وەک دەبینن دایکان لە نێوان دوو بەرداشدان؛ لە لایەکەوە پەشیمانی ئەوەی ناتوانێت پێداویستیی کۆرپەکەی بەجێ بهێنێت، لە لایەکـی تریشـەوە داخوازییە بێبەزەییەکانی دنیای دەرەوە. بەڵام دەڵێی چی، خۆ چـاوەڕێی ئەوە لە کۆمەڵگەی بەکاربەری ئەمڕۆ ناکەیت، لەم پێداویستییانە و هاوشـێوەکانیان تێبگات. خاوەنکارێک هەتا زیادکردنی توانـای بەرهەمهێنـانی کۆمپانیـاکەی وەسـتابێت، چیـی داوە لەوەی ئایـا دایکێـک دەتوانێـت بچێـت بەدەم منداڵەکەیەوە یان نا. ئەو چاوی لەوەیە کێ ئیشی زیاتری بۆ بکات، نەک کـێ دایکایەتی بکات.

تەنانەت تێگەیشتووترین خاوەنکاریش پێی خۆش نییە لە چەند مانگێـک زیاتر، دایکی تازەمنـداڵبوو لەسـەر کـارەکەی دوور بێـت، هەر زوو گڵـۆپی ئاگادارکردنەوەی بۆ هەڵدەکات. بـارودۆخەکە هەر چـۆن بخوازێـت، گرنـگ ئەوەیە دایکـان بـزانن باشـترین بـژاردە ئەوەیە دایـکەکە ئەو مـاوەیە لەگەڵ منداڵەکەیدا بەسەر بەرێت. دەتوانێ ڕێوشوێنی دیـکەش بگـرێتە بەر، لەوانە: نیوەدەوام بکات، بە شێوەی هۆم ئـۆفیس لە مـاڵەوە کارەکـانی بەڕێ بکـات، مۆڵەتی بێ مووچە وەربگرێت، یان ئەگەر زەمینەکە گونجاو بوو، منداڵەکەی لەگەڵ خۆی بەرێت بۆ شوێنی کارەکەی.

پێم وایە لەم جۆرە حاڵەتانەدا، سەنگی بەرپرسیارێتی زیاتر لەسـەر شـانی بەڕێوەبەر و خاوەنکارانە نەوەک دایکان. بەو مانـایەی؛ دەتـوانن ڕێوشـوێنی

جێگرەوە بگرنە بەر لەپێناو ئاسانکاری بۆ ئەو دایکانەی تـازە منـداڵیان بووە. ئەمە هەم لە ڕووی مرۆڤبـوونەوە، هەم لە ڕووی زیـادکردنی بەرهەمـداریی ئیشەوە گرنگە. تۆ بیر لە کارمەندێک یان فەرمانبەرێـک بـکەنەوە، کە تەواوی ڕۆژ نیگەرانی ئەوەیە منداڵەکەی لای دایەنێک جێ هێشتووە، کەسێکی لەم جۆرە چۆن دەتوانێت بەرهەمدار بێت!

لەم سـۆنگەیەوە بە چـاوێکی گـرنگەوە دەڕوانیـنە ڕۆڵـی خاوەنکـار و بەڕێوەبەرەکان. دەتوانن ڕێگە خۆش بکەن دایکان منـداڵەکانیان بهێنن، یان شوێنێکی تایبەت -دایەنگەیەکی بچووک- تەرخان بکەن، تاکو دایکان بتوانن لە ڕۆژەکەدا چەند جارێک چاویان بە کۆرپەکانیان بکەوێـت و پێداویستییەکانیان پڕ بکەنەوە. با بەڕێوەبەر و خاوەنکارە بەڕێزەکـان بـزانن بە ئاوڕدانەوەیـان لەم بابەتە، خزمەتێکی گەورە پێشکەش دەکەن.

ئەگەر ئەوەشیان بۆ نەکرا، با لانـی کەم تـا کـاتی لە شـیر بـڕینەوە هەلی مۆڵەتی بـێ مـووچە بـخەنە بەردەم کارمەنـدەکانیان. بەڵام ئەگەر دۆخەکە بە شێوەیەك بوو دایک ناچار بوو لەنێوان دەوام و منداڵدا یەکێکیان هەڵبژێرێت، ئەوا لە ڕوانگەی تەندروستیی ڕۆحیی منداڵ و ئایندەی دایکەکەوە، پێشنیاری بژاردەی دووەم دەکەین کە ئەویش منداڵە.

## نیشانەکانی نەخۆشیی منداڵی فەرامۆشکراو

جاری وایە هەلومەرجەکـانی ژیـان بە شـێوەیەك هەڵـدەکەن، دایـک ناچار بگەڕێتەوە بۆ دەوامەکەی. هەڵبژاردن لەنێوان (دەوام یان منـداڵ)، بڕیـارێکی هەروا ئاسان نییە. بـۆیە لە وەهـا حاڵەتێکـدا، پێویسـتە دایـکەکە بەوردی چـاودێری گەشـەی ڕۆحیـی منـداڵەکەی بکـات، چـونکە ئەو منـداڵانەی لە (٤) ساڵی یەکەمی تەمەنیاندا لە دایکیـان دوورن و پێداویسـتییە فیزیکـی و دەروونییەکانیان

لەکاتی خۆیدا و بە بـڕی پێویسـت پـڕ نەکـراوەتەوە، ئەگەری زۆرە دوچـاری ئەو حاڵەتە ببن کە لە دەروونناسیدا بە (نیشانەکانی نەخۆشیی منداڵی فەرامۆشـکراو) یـان (نیشـانەکانی نەخۆشـیی دادە) نـاسراوە. لەبەر ئەوە دەبێـت دایکـان زۆر هەستیاربن لە هەڵبژاردنی ئەو کەسەی منداڵەکەیانی سپاردە دەکەن.

ئەو منـداڵانەی تووشـی ئەم حـاڵەتە - نیشـانەکانی نەخۆشـیی منـداڵی فەرامۆشـکراو- دەبـن، بەگشـتی داخـراو دەردەچـن و پەیوەنـدی لەگەڵ دەوروبەریان دەپچڕێنن. ئەوەندە دڵتەنگ و خەمبار دەنوێنن، دەڵێـی لە ژیـان زویر بوون. کە دایکی یان یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی دەبینێت، کەمێک دڵخۆش دەبێـت، بەڵام هەر زوو خـۆری شادمانییەکەی ئاوا دەبێت و لای ئەوانیش دەچێتەوە قاوغەکەی خۆی.

**ئەگەر منداڵ لە ڕووی ڕۆحییەوە نەیتوانی وابەستەی دادەکەی ببێت، توانای پەیوەندی دروستکردنی لاواز دەردەچێت.**

بەپـێچەوانەی ئەمەوە، لە هەنـدێك حاڵەتـدا منـداڵەکە بە شـەڕانگێزی و هـارییەوە دەیگرێـت. دەڵێـی تـۆڵەی ئەوە دەسـەنێتەوە کە لای دادەکەی دانـراوە، ئەویش بە پەلاماردان، شکاندن و فڕێـدانی ئەوەی دێـتە بەر دەسـتی. شـەڕخواز و هاروهـاج دەردەچێـت، ئەگەر بەقسـەی نەکەن یەکسەر پەنا دەباتە بەر پەستی و شینوشەپۆڕ.

شتێکی سروشتییە کە ئەو پەیوەسـتییەی لەنێـوان دایـک و منداڵـدا هەیە، دەمودەست لەنێوان دادە و منداڵدا دروسـت نابێـت. لەم ڕووەوە زۆر گـرنگە ئەو کەسەی سەرپەرشتیکردنی منداڵێک دەگرێتە ئەستۆ، بـۆ مـاوەیەک کـاتی لەگەڵدا بەرێتە سەر و هەنگـاو بە هەنگـاو لە پێداویسـتییە جەسـتەییەکانیەوە دەست پێ بکات، نەک ئەوەی کتوپڕ دایکەکە جێی بهێڵێـت و بیسـپێرێت بە

کەسێکی نەناسراو. بۆیە وا پێویست دەکات چەنـد ڕۆژێـک دادەکە یـاوەریی دایـکەکە بکـات و بزانێـت چـۆن هەڵسـوکەوت لەگەڵ ڕۆڵەکەیـدا دەکـات، بەدوایدا دەتوانێت دەست بکات بە پێداویستییە جەستەییەکانی. بـۆ نمـوونە، دادەکە دەتوانێت پاکی بکاتەوە، بە مەرجێك دایکیشی لەپاڵیانـدا وەستابێت. هەرچی پێداویستییە سۆزدارییەکانیشە، دەبێـت دایـکەکە خـۆی بەدەمیانەوە بێت. ئەوە دایکەکەیە دڵنەوایی دەکات، کاتێک دەکەوێت و شوێنێکی ئازاری پێدەگات. ئەگەر لەو نێوەندەدا گرفتێک نەیەتە پێش، ئەوا ماوەی ڕاهاتنی دادە و منداڵ بە یەکتری، تێکڕا شەش هەفتە دەخایەنێت. تەنانەت دوای چوارەمین هەفتە، ئاساییە دایکەکە بۆ چەند کاتژمێرێك مـاڵ جـێ بهێڵێـت. خـۆ ئەگەر دوای گەڕانەوەی -لە ئەگەری نەبـوونی گرفتـی تەندروسـتیدا- دەگریـا و لە دایکی دەدا و نەدەچووە باوەشی و نوزەنوزی دەکرد، ئەوکات دایکەکە حەقی خۆیەتی بیر لەوە بکاتەوە کە داخۆ دادەکە گونجاوە یان نا. دەبێت ئەوە وەبیر خۆمـان بهێنیـنەوە، کە وردبینیـی دایـک لەم جـۆرە حاڵەتـانەدا لەوپەڕی گرنگیدایە. چونکە ئەگەر منداڵەکە نەتوانێت لە ڕووی سۆزدارییەوە بگـات بە دادەکەی، ئەوکات بەلاتانەوە سەیر نەبێت ئەگەر توانـای پەیوەنـدی بەستنی لاواز بێت. بێگومان ئەوەش سەر دەکێشێت بۆ لاوازی لە توانای هاوسۆزی و تێگەیشتن لە بەرامبەر.

> **باش وایە دادە تەنها ئەرکی چاودێریکردنی منداڵەکەی پێ بسپێررێت، سەرقاڵ نەکرێت بە چێشتلێنان و ئیشی ناوماڵەوە.**

با ئەوەش بڵێین کە لە هەندێك حاڵەتـدا تەنانەت بۆ دایکانیش، زەحـمەتە ڕۆژێکـی تێروتەسەل لەگەڵ ڕۆڵەکانیان بەسـەر بەرن. ئـاخر خـۆ ئەرک و بەرپرسـیارێتییەکانی سەرشـانی، تەنهـا لەودا کـۆ نەبـوونەتەوە. ئەوەتـا ئیشـوکاری ناومـاڵ، چێشـتلێنان،

داواکارییەکانی مێرد، پێداویستی منداڵەکانی تری -ئەگەر هی تری هەبێت- لە سەرەدا وەستاون و چاوەڕێن بێت بەلایانەوە. بۆیە هەر فریای ئەوە دەکەوێت منداڵەکەی پاک بکاتەوە و خواردنی بداتێ و بیخەوێنێت. هەمان شت بۆ دادەش ڕاستە؛ ئەگەر ئیشوکاری زۆری درابێت بەسەردا، ناتوانێت لایەنە ماددی و مەعنەوییەکانی منداڵەکەی بەر دەستی تێر بکات. لەبەر ئەوە وا باشە کە تەنها ئەرکی چاودێریکردنی منداڵەکەی پێ بسپێردرێت، سەرقاڵ نەکرێت بە چێشت و ئیشی ناو ماڵەوە. دەنا بە جەستەیەکی شەکەت و ماندووەوە چۆن بتوانێت سۆز و گرنگیی پێویست بدات بە ڕاسپاردەکەی بەر دەستی.

لایەنێکی تری پەیوەندیدار بە بابەتەکەمانەوە، کە ناکرێت بازی بەسەردا بدەین ئەوەیە: کاتێك دایک لە تەمەنێکی زووەوە سەپەرشتیکردنی منداڵەکەی دەداتە دەست کەسێکی تر -با بڵێین دادە- ئەگەری ئەوە هەیە لەنێوان دایک/منداڵدا حاڵەتێکی ناجۆر بێتە ئاراوە، کە بە (پەرلەی ڕەفتاری) یان کۆدی سلوکی ناسراوە.

## پەرلەی ڕەفتاری

وەك دەزانن، هەر یەک لە ئێمە خاوەنی کۆمەڵە هەڵسوکەوت و سلوکێکین کە لە خێزانەکەمانەوە هێناومانە. دڵخۆشی، خەمباری، تووڕەیی، ئازار لە هەر خێزانێکدا بە شێوەیەک گوزارشتی لێ دەکرێت. ئێمە بەم حاڵەتە دەڵێین (پەرلەی ڕەفتاری).

بۆ نموونە؛ لەوانەیە لە خێزانێکدا شێوازی دەربڕینی تووڕەیی بریتی بێت لە دەنگبەرزکردنەوە و دەستوەشاندن، ئەگەری ئەوەش هەیە ئەم شێوازەش لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بگوازرێتەوە. یان لەوانەیە لە خێزانێکدا هەستی دڵخۆشی لە ڕێگەی تریقەلێدان و هەڵبەزینەوە گوزارشتی لێ بکرێت.

کەچی هەمان هەست لای خێزانێکی تـر، لە شـێوەی کزکردنـی چاوەکـان و بزەیەکی شیرین، یان دەست خستنە سەر دەموچاو خـۆی دەنوێنێـت. لەمەوە دەگەینە ئەوەی کۆدی ڕەفتاری هەر خێزانێک جیاوازە لە هـی خێزانێکـی تر. ئەوەشمان بیـر نەچێـت، ئەم تایبەتمەنـدییە گـرنگترین هۆکـاری ئـاڵوگۆڕی هەستەکانە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا.

جاری وایە دەبیستین یـان بەر چاومـان دەکەوێـت، کە لەنـاو خێزانێکـدا یەکێکیان بەوی تریان دەڵێت: "توخـودا ئەوە کەی پێکەنیـنە؟" هۆکـاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، هەستێک بە کـۆدێکی جیـاواز لە کـۆدی تـایبەت بەو خێزانە دەربڕراوە.

بۆیە لەسەر ئەو مەسەلەیە وەسـتاین، چـونکە یەکێـک لە خەسـڵەتەکانی ئەو منـداڵانەی گیـرۆدەی نیشـانەکانی نەخۆشـیی دادەن، ئەوەیە دەبـنە خـاوەنی کۆدێکی جیاواز لە کۆدە خێزانییەکەی خۆیان. دەرەنجـامی ئەمەش، پێکەوە نەگونجانی دایک و منداڵە. کاتێك لە دایکـی دوورە، چـاو لە هەڵسـوکەوتی دادەکەی دەکـات، کە ئەویـش لە بنەڕەتـدا لە خێـزانەکەی خـۆیەوە وەری گرتووە. واتە پێکەنین و گریانی، وەک پێکەنین و گریانی خێزانێکی تری لێ دێت. لەم نێوەندەشـدا، دایـک دەبینێـت ڕۆژ دوای ڕۆژ منـداڵەکەی کـۆمەڵە هەڵسوکەوتێک دەنوێنێ کە پێیان ئاشنا نییە. بۆیە تووڕە دەبێـت و خـۆی پێ ناگیرێت. منداڵەکە گوێی لە نوکتەیەک دەبێـت، لەبـری "هاهـا... هاهـا"، بە "هیـی... هیـی" پێکەنیـنەکەی دەردەبڕێـت. جـا وەرە دایـک بەوە ئـارامی بمێنێـت! یەکسـەر ئاگـاداری دەکـاتەوە، بەڵام ئەو خەیـاڵی لای پێکەنینی خۆیەتی، نازانێت دایکی بۆچی ئاگاداری دەکاتەوە.

بەڵام دۆخــی ئەو منــداڵانەی پەیوەســتبوونێکی دڵنیاییبەخشــیان هەیە بە دایکیانەوە، شتێکی ترە. چاولێکردنی ئەوان لاساییکردنەوەیە، نەک کـۆپیکردن. منداڵ بە کێوە پەیوەست بێت، ڕەفتاری ئەو کەسە وەردەگرێت.

## کە وایە ئەو دایکانەی دەوامیان هەیە، پەنا نەبەنە بەر دادە؟

با سەرەتا قسەکانی سەرەوە لە یەک دوو ڕستەدا کورت بکەینەوە:

باش وایە تاوەکو (٤) ساڵی، دایک لە منداڵەکەی جیا نەبێتەوە. ئەگەر ئەوەش ئەستەم بوو، لانی کەم دوو ساڵی یەکەم لەلای بێت. خۆ ئەگەر ئەوەش نەدەکـرا، ئەوسا لەبری گرتنی دایەن -با خاوەن بڕوانامەش بێت لەو بوارەدا- گرنگی زیـاتر دەدەین بەوەی لای کەسێکی نزیکی خێزانەکەمان دایبنێین.

داپیرە و باپیرەش یەکەم کەسن کە دێن بە خەیاڵدا، بەدوایدا پوورەکـان، ئینجـا ئەو ئامۆزا و پوورزا و خاڵۆزایانەمان کە خانمی پێگەیشتوون.

با بڵێـین هـیچ کـام لەوانەی سـەرەوە بەردەسـت نـین، ئەدی ئەو کـات؟ لەو حـاڵەتەدا -بە مەرجێـک شـوێنی لەبـار هەبێـت- ڕێنمایـی دایـکەکە دەکەیـن منـداڵەکەی لەگەڵ خـۆی بەرێـت بـۆ دەوام. واتە دایەن گـرتن، دەبێـت کۆتـا بژاردەمـان بێـت. ئەویـش کەسـێکی نزیـک بێـت لە بەهـا مەعـنەوی و کلتوورییەکـانی خێـزانەکەوە و هەسـتەکانی زینـدوو بـن و لە توانایـدا بێـت دایکایەتی بکات.

## جیاوازیی نێوان قۆناغی (٠-٤) ساڵی لەگەڵ (٤-٧) ساڵی

ئەگەر بیرتان بێت، پێشتر لەسەر ئەوە وەستاین کە لە (٠-٤) ساڵیدا منداڵ لەژێر کاریگەریی پاڵنەرە ناوەکییەکانیدا هەڵسوکەوت دەکات. کاتێک دایکیش بەپێچەوانەی ئەمەوە دەجووڵێتەوە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی منداڵەکە هار دەبێت و ئۆقرەی لێ دەبڕێت.

ئەو منداڵانەی ئێمە پێمان وایە نازونوز دەکەن یان عینادن، لە ڕاستیدا ئەو منداڵانەن کە بەربەست خراوەتە بەر (بەرنامەی فێربوونی ژیان)ەکەیان. ئەو هەڵسوکەوتە ناجۆرانەش کە من و تۆ دەیبینین، هیچی تر نییە جگە لەوەی بەرهەڵستی ڕێگرییەکانی دایک و باوکی دەکات.

بۆ نموونە؛ منداڵەکە دەیەوێت دەست بدات لە شتێک و بزانێت چییە، کەچی لەولاوە دایکی ڕێساخواز بە دەنگێکی بەرز هۆشیاری دەداتێ: "نەکەی بفففەیە!"

لە وەها دۆخێکدا منداڵی بەستەزمان لەنێوان دوو بژاردەدا گیر دەخوات؛ پاڵنەری فێربوونی ناوەکی، لەگەڵ ئاگادارییە توندەکەی دایکی. بەڵام دوا جار ئارەزووی فێربوون زاڵ دەبێت و بەرەو تەواوکردنی گەشە فێرکارییەکەی دەیداتە بەر.

ئیتر دایکەکە پێی وایە کەسێکە قسەی ناڕوات. بۆیە بە دەنگێکی بەرزتر و توندتر لەوەی پێشوو ئاگاداری دەکاتەوە: "ئەوە نەموت دەست بۆ ئەوە نەبەیت!"

## ئەو یاسا و ڕێسایانەی لەگەڵ ڕۆحی منداڵدا یەك ناگرنەوە

منداڵ زۆر بەلایەوە سەختە کە دەبینێت هەڕەشەی زبری دایکی زاڵ بووە بەسەر ئارەزووی فێربوونەکەیدا، بۆیە دەمودەست دەست دەبات بۆ چەکەکەی؛ گریان. ڕاستە دایکەکە قسەی خۆی سەپاندووە، بەڵام لە هەمان کاتدا بەرنامە ناوەکییەکەی ڕۆڵەکەشی پەک خستووە. زیاد لەوە، بووەتە هۆکاری ئەوەی بکرووزێتەوە و هاروهاجی بکات، بەڵام دوا جار ئەویش مرۆڤە، مرۆڤیش بیەوێت پارێزگاری لە خۆی بکات، پەلامار دەدات. پیاوێک بهێننە پێش چاوی خۆتان کە لەبەر هەڵەیەکی گچکەی ژنەکەی، بێڕێزیی بەرامبەر دەنوێنێت و بە دەست و زوبان ئازاری دەدات. پێتان وایە چۆن وەڵام دەدرێتەوە؟ گومانتان نەبێت ژنەکەشی دەکەوێتە پەلاماردان. هاوشێوەی ئەمە، ئەو منداڵەش کە ڕێگەی کەشفکردن و فێربوونی لێ گیراوە، بە پەلاماردانی دایکی هەوڵ دەدات بەرگری لە خۆی بکات.

> **ئەو منداڵەی لە ڕێگەی "دەستی بۆ نەبەی، بقققەیە"، تەگەرە دەخرێتە بەردەم خولیای فێربوون و پشکنینەکەی، بەرگری لە خۆی دەکات و لە دایکی دەدات.**

**ڕەنگە لێرەدا پرسیارێک بێتە پێش:**

**باشە ئەگەر وازی لێ بهێنین و خۆمان هەڵنەقورتێنین، لە دواییدا گیر ناخۆین بەدەستیەوە؟**

**خۆی لە ڕاستیدا مەسەلەکە ئەوەیە.. یەکێک لەو هەڵانەی دایکانی خاوەن منداڵی تەمەن (٠-٤) دەکەونە ناوییەوە ئەوەیە، لە خۆوە یاسا و ڕێسای بێبنەما**

دادەنێن، کە هیچ کامیان بە ڕۆحی منداڵ ناخوات و دەرەنجامی خوازراوی لێ ناکەوێتەوە.

مەبەستت چییە لە "ئەو یاسا و ڕێسایانەی کە لەگەڵ ڕۆحی منداڵدا یەك ناگرنەوە ؟".

با بە نموونەیەک ڕوونی بکەینەوە: گریمان منداڵەکە بەو گۆزە بەنرخەوە گرتوویەتی، کە تۆ بۆ جوانی لەسەر مێزەکە داتناوە. هەموو جارێک دەستی بۆ درێژ دەکات و دەیەوێت خۆی پێ بگەیەنێت. تۆش لە هەر جارێکدا لای دەبەیت و دەیشاریتەوە. ئەم ڕەفتارە تەبا نییە لەگەڵ ڕۆحی منداڵدا. ئەو ناچارە (قۆناغەکەی داخوازی ئەوەیە) دەست بەرێت بۆ ئەو گۆزەیەوە و لەبارەیەوە زانیاری بەدەست بهێنێت. خاتوونی ماڵیش هەموو سەرنجی لای ئەوەیە، چۆن گۆزەکە بەسەلامەتی ڕزگار بکات. بۆیە لێرەوە ڕێنمایی ئەو دایکانە دەکەین کە خاوەن منداڵی ئەو تەمەنەن (٠-٤ساڵ)، ناو ماڵەکانیان با بە جۆرێک دیزاین بکەن، بگونجێت لەگەڵ ڕۆحی منداڵ و ئەو خولیا بێشومارەی هەیەتی بۆ فێربوون. بە کورتی، با کەلوپەلی شووشە و گرانبەها لەبەر دەستدا دانەنێن.

منداڵەکە دەیەوێت دەست بدات لە پەڕەی ڕۆژنامەکە و گوێی لەو دەنگە سەیرە بێت (خشەخش) کە لێیەوە دەردەچێت. بڕوا ناکەم ڕۆژنامە شتێکی ئەوەندە گرانبەها بێت، کەچی هەر بێبەش دەکرێت لە بەدیهێنانی خواستەکەی.

> بەر لەوەی بزانن هاتوونەتە چ دنیایەکەوە و فێری شتەکانی ناوی ببن، خۆیان لەبەردەم ڕێسا بێشومارەکانی گەورەکاندا دەبیننەوە.

بەلای منداڵەوە لەوە بێماناتر نییە پێی بڵێی "دانیشە!"، یان "مەکە!" لەو کاتەدا کە خەریکە پاڵ بە کورسییەکەوە دەنێت، یان هەوڵ دەدات بەسەر قەنەفەکەدا سەر بکەوێت، چونکە لە مێشکی خۆیدا وا بیر

دەکاتەوە: "باشە، ئەوە بۆ دایکم ناهێڵێت دەست بەرم بۆ ئەو کورسییە؟ لەبەر چی ناتوانم لەسەر قەنەفەکە هەڵبەز و دابەز بکەم؟"

هێشتا لە تەمەنێکدا نییە لە حیکمەت و واتای قەدەغەکراوەکان تێبگات، بۆیە سەر دەرناکات لەوەی بۆچی کۆمەڵە شتێکی لێ قەدەغە دەکرێت.

ئەی ئەو شتانە چین کە واتایەک هەیە لە قەدەغەکردنیاندا؟ با بە نموونەیەک وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە: گریمان خەریکە دەست دەبات بۆ کارەبا، بە چەقۆ دەستی خۆی ببڕێت، یان لە پەنجەرەوە بکەوێتە خوارەوە، ڕەفتاری دایک لەم حاڵەتانەدا دەبێ چۆن بێت؟

ئاشکرایە ڕێساداری لەم چەشنە حاڵەتانەدا نەک هەر واتادارە، بەڵکو پێویستیشە. تێگەیشتن یان تێنەگەیشتنی منداڵ، شتێک لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. ئەو جووڵە و دەربڕینانەی دایک بەکاریان دەهێنێت، دەبێت لەوپەڕی سادەیی و ڕوونیدا بن، پێویستە قسەکانی دوور بن لە دەستەواژەی تۆقاندن، یان ئەوەندە دوورودرێژ بن منداڵەکە یەکسەر لێیان تێنەگات.

لە نموونەی پلاکی کارەباکەشدا، پێویستە دایکەکە لە جێی خۆی ڕاست بێتەوە -بێ ئەوەی هەستێتە سەر پێ- چاوی لەسەر چاوی منداڵەکەی لا نەبات و بەبێ هاوارکردن و چاوبزکردنەوە پێی بڵێت: "مەکە!"

## "مەکە!"

ئاگادارکردنەوەکەی دایک لە ڕێگەی دەستەواژەی "مەکە!"وە مانایەکی ئەوتۆی نییە لای منداڵەکە، چونکە هێشتا دەرک بەوە ناکات ئەو شتە چییە کە نابێت بیکات، لەبەر ئەوە چەند هەنگاوێکی تر دەچێتە پێش. لەم بارەدا پێویستە دایکەکە بە هەمان شێواز و پێداگریی جاری یەکەمەوە، ئاگادارییەکەی دووبارە بکاتەوە. لەوانەیە دەرک بەوە بکات کە شتێکی

نائاسایی لەئارادایە، بەڵام دیسانەوە ئەوە نابێتە ڕێگر لەوەی دەست نەبات بۆ پلاکەکە. لە دوا هەنگاودا، پێویستە دایکەکە هەڵبستێت و منداڵەکە بگرێتە باوەش و دووری بخاتەوە، لەو نێوەندەشدا بە هەمان شێواز و پێداگریی جارەکانی پێشوو پێی دەڵێتەوە: "مەکە!"

تۆ بڵێی بەو شێوەیە فێر ببێت جارێکی تر دەستی بۆ نەباتەوە؟

نەخێر، بەپێچەوانەوە ئەم جارە بەئەنقەست بەرەو پلاکەکە دەچێت، بەڵام ئەم جارە مەبەستیەتی لە دایکی و لەو یاسایە تێبگات کە دایکی بۆی داناوە. لەم بارە نوێیەدا پێویست ناکات دایکەکە خۆی بشڵەژێنێت و بکەوێتە هاوار. ئەوەندە بەسە هەمان هەڵوێستی جارەکانی پێشوو دووپات بکاتەوە؛ چاو دەبڕێتە چاوی و بەلەسەرخۆیی پێی دەڵێت: "مەکە!" گومان نەبەن کۆڵی داوە، بەڵکو دوا هەڵمەتی خۆی دەبات و دەستی بۆ درێژ دەکات، بەڵام پێداگریی ئەم جارەی دایک، وای لێ دەکات هەنگاوێکی تر نەنێت.

ئیدی پرۆسەی "مەراقکردن و خولیای کەشفکردنی پلاکی کارەبا" دەگۆڕێت بۆ پرۆسەیەکی تر، کە ئەویش بریتییە لە "مەراقکردن و خولیای فێربوونی شتێک کە کاردانەوەی دایک دەبزوێنێت". پرۆسەکە کەوتووەتە سەر ئەو هەڵوێستەی دایکەکە دەینوێنێت. پێداگرییەکی شێلراو بە نەرمی و لەسەرخۆیی، وا دەکات منداڵەکە چێژ لەم فێربوونەی تریش وەربگرێت.

وەک بینیتان، دایکەکە نەهات بە دەستەواژە و دەربڕینی قورس و قەرەباڵغ زیهنی جگەرگۆشەکەی ماندوو بکات، یان تووشی پەشۆکانی بکات: "دەستی بۆ نەبەی، کارەبا دەتگرێت." یان "ئەی هاوار بەماڵم، دەست نەدەی لەو پلاکە!" بەڵکو تاکە دەستەواژەیەکی کورت و سادەی بەکارهێنا: "مەکە!" دایکەکە بەو هەڵوێستە کورت و پێداگرانەیەی نواندی، مانای "مەکە"ی فێری منداڵەکەی کرد، ئیتر دەتوانێت بۆ هەموو حاڵەتێکی مەترسیدار بەکاری

بهێنێت. بۆ نموونە؛ هەمان شێواز بەکار دەهێنین بەرامبەر ئەو منداڵەی چەقۆی هەڵگرتووە و ئەگەری هەیە دەستی خۆی زامدار بکات. کە پێی دەڵێی "مەکە!"، سەرەتا دەکەوێتە دوودڵییەوە، ئینجا لە هۆشی خۆیدا دەکەوێتە فراوانکردنی واتای مەکە، ئەمەش دەبێتە هاندەری ئەوەی چەقۆکە دابنێت. لە ئەگەری کەوتنە خوارەوە، سووتان یان هەر زیانێکی تردا، دەتوانیت سوود لە کاریگەریی ئەفسووناویی ئەم دەستەواژەیە وەربگریت. بەڵام دووپاتی دەکەمەوە، نیگای چاو خاڵی جەوهەرییە.

ئاگاداری: ئەم شێوازە تەنیا بۆ حاڵەتی مەترسیدار ڕاستە. منداڵەکە دەیەوێت دەست بەرێت بۆ شتێک، کاغەز دەدڕێنێت، یان یاری بە پێڵاوەکانی ڕاڕەوەکە دەکات، دروست نییە لەو جۆرە حاڵەتانەدا ئەم شێوازە بەکار بهێنین.

ئەگەر سەرنجتان دابێت، دڵنیام ئێوەش هەستان بەوە کردووە کە یەکێک لە گەورەترین ترسەکانی دایک ئەوەیە منداڵەکەی (گوێڕایەڵ نەبێت). لەپێناو ڕەواندنەوەی ئەو ترسەدا، زۆرێک لە دایکان بەزوویی مشووری خۆیان دەخۆن؛ بە منداڵی ئەوەندە دەیچەوسێننەوە تا وای لێ دێت لە قسەیان دەرناچێت. تازە چاوی کردووەتەوە، هێشتا نازانێت ژیان چییە، دایکی دەیداتە بەر تەوژمی (مەکە) و (نابێت).

لێرەدا خاڵێکی هەستیار هەیە نابێت لەبیرمان بچێت: دایک و باوکی هۆشمەند، دەزانن کە لە پەروەردەی منداڵدا شتێک هەیە پێی دەوترێت قۆناغبەندی یان پلەبەندی. پەروەردە و مامەڵەی منداڵێکی تەمەن (٣) ساڵ، بەدڵنیاییەوە جیاوازیی هەیە لەگەڵ شێوازی پەروەردە و مامەڵەی منداڵێکی تەمەن (١٣) ساڵ.

بۆیە ترس و خەمی دایکان لەوەی منداڵەکەیان بەقسەیان نەکات، ئەو منداڵانە ناگرێتەوە کە لەنێوان (٠-٤) ساڵیدان. ئاخر منداڵی ئەو تەمەنە

نازانێت یاسا و سنوور چییە، توانای زیهنی هێشتا ئەوەندە گەشەی نەکردووە دەرک بەو شتانە بکات. بۆیە دانانی هەر یاسایەک بۆ ئەو تەمەنە، بێمانایە -لە ڕوانگەی ئەوانەوە- هاوکات وا دەزانن بەربەستێکە و هێنراوەتە سەر ڕێیان.

زیهنی منداڵ لەدوای (٤) ساڵییەوە دەتوانێت لە ڕێسـاداری و سـنوور بۆ دانان تێبگات. بۆیە کە دایکێک بە منداڵە (٣) سـاڵانەکەی دەڵێـت: "نەچیتە ئەوێ" ئەمە بۆ ئەو خـاڵییە لە هەمـوو جـۆرە مانـا و ناوەڕۆکێـک، تەنها ئەوە تێدەگات کە دایکی دەیەوێت ڕێگەی لێ بگرێـت، بـۆیە دەسـت دەکـات بە گریان و وڕکگرتن.

کاتێـک دایـک هەڵدەسـتێت بە دانـانی (دەبێت و نابێت)ەکان و دەسـەڵاتی خـۆی بەسـەر منداڵەکەیـدا دەسـەپێنێت، ڕۆحـی ناسـکی منـداڵ زیـانی گەورەی بەر دەکەوێـت. سـەیر لەوەدایە لە کۆتاییـدا منداڵەکە بەو جۆرە دەردەچێت، کە دایـکەکە لێی دەترسا.

> **منداڵی تەمەن (4-0) ساڵ، نازانێت یاسا و سنوور چییە، توانای زیهنی هێشتا ئەوەندە گەشەی نەکردووە دەرک بەو شتانە بکات.**

# منداڵانی تەمەن (٤-٧)ساڵان



لەدوای (٤) ساڵییەوە خۆشترین شت بۆ منداڵ، بـریتییە لە ناسـینی ئەو یاسـا و ڕێسـایانەی ڕووداوەکـانی دەوروبەری کـۆنترۆڵ دەکەن. حەز دەکەن بـزانن شتەکان چـۆن ئـیش دەکەن، چـونکە لەم قۆنـاغەدا هەوڵ دەدەن خۆیـان وەک کەسە پێگەیشتووەکان ببینن. وەها خەیاڵ دەکەن ئەگەر ئەو شـتانە بـزانن، واتـای وایە گەورە بوون. ئاداب و ئوسوڵی شـتێک چـۆن بێـت، ئەوانـیش هەوڵ دەدەن بەو شێوەیە ئەنجامی بدەن. هەڵپەی فێربوونی یاسـا و ڕێسـا گشـتییەکانیانە، جـا دەکرێ ئەوە یاسا و ڕێسای یاری، نووسین و خوێندنەوە، یان پاکژی بێت.

## چۆن فێری یاسا و ڕێکخستنیان بکەین؟

منداڵی شپرزە و ناڕێک، مایەی دەردەسەریی زۆرێـک لە دایکـانە. لەتـاو شـپرزەیی و پەرش و بڵاویـی منـداڵ، جـاری وایە ئەوەنـدە هەسـت بە بێدەسـەڵاتیی خۆیـان دەکەن، ناچارن زەبر و هێـز بەکـار بهێـنن. هەر ڕێسـایەکیش بە زەبـری هێـز جێبەجێ کرابێت، چەندین کێشەی تری لێ دەکەوێتەوە.

> یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی پەروەردەی منداڵ ئەوەیە، نەکەویتە ململانێ لەگەڵی. بەکارهێنانی شێوازی فەرمان بەسەرداکردن، لە شێوەی "دەی فێر بە، وا بکە... هتد." تا بڵێی هەڵەیە.

یەکێـک لە بنەمـا سـەرەکییەکانی پەروەردەی منـداڵ ئەوەیە، نەکەویـتە ململانـێ لەگەڵـی. بەکارهێنـانی شـێوازی فەرمـان بەسـەرداکردن، لە

شێوەی "دەی فێر بە، وا بکە... هتد." تا بڵێی هەڵەیە. هەر ئەوانەشە دەبێتە هۆکاری ئەوەی بەرپەرچی دایک و باوکی بداتەوە و تەنها ئەو کاتانە جێبەجێی بکات کە ئەوان دەیبینن.

## دەبێت قەناعەتی بە ڕێساکان هەبێت

خاڵێکی جەوهەری هەیە لە پەروەردەی منداڵدا، کە ئەویش بریتییە لەوەی منداڵ قەناعەتی بۆ دروست ببێت سەبارەت بەو شتانەی ئەنجامیان دەدات. بۆ نموونە؛ با وا دابنێین لانە، منداڵە شەش ساڵانەکەی خانەوادەی کاک هێمن، تا درەنگانێکی شەو بەدیار دایک و باوکیەوە دادەنیشێت و ناخەوێت. ئەگەر گوڵزار خانی دایکی پەنجەی لێ ڕابوەشێنێت و بە تووڕەییەوە پێی بڵێ: "خێرا بچۆ بخەوە!" ئەوا کارێکی دروست ناکات، چونکە نەک هەر سوودی نییە، بگرە وا دەکات لانە بچێتەوە بەگژ دایکیدا.

> ئەو دایکانەی خوازیارن ڕێساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی فێری ڕۆڵەکانیان بکەن، پێش هەموو شتێک پێویستە لەسەریان پەلە نەکەن، هەروەها ئەوەندە سنگفراوانیش بن هەڵەی بچووکی ڕۆڵەکانیان لا گەورە نەبێت.

ئەو دایکانەی خوازیارن ڕێساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی فێری ڕۆڵەکانیان بکەن، پێش هەموو شتێک پێویستە لەسەریان پەلە نەکەن، هەروەها ئەوەندە سنگفراوانیش بن هەڵەی بچووکی ڕۆڵەکانیان لا گەورە نەبێت. دایکی هۆشمەند کە منداڵەکەی هەڵەیەک دەکات، ناچێت وەک هەورەتریشقە بگرمێنێت بەسەریدا و ڕووشکێنی بکات، بەڵکو بە وێنەی فریشتە ئەم پەیامەی پێ دەگەیەنێت:

"هەموو کاتێک لەگەڵتدام، ئامادەم یارمەتیت بدەم تاکو ڕێساکانی ژیان فێر ببیت." ئەگەر دایک بەو جۆرە بێت، ئیتر منداڵ بۆ لە خۆشیدا باڵ نەگرێت!

بۆیە کاتێک دایکان دەیانەوێت شتێک -ڕێسایەک یان شێوازێک- سەبارەت بە ژیان فێری منداڵەکانیان بکەن، گرنگە ئەم خاڵانەی خوارەوە بەهەند وەربگرن:

## ١- منداڵ گوێ بە ڕێسایەك نادات، کە هەر خۆی بگرێتەوە

ڕەنگە ئەوەی ئێستا دەیڵێم بەلاتانەوە سەیر بێت، بەڵام لەڕاستیدا منداڵ زۆری حەزی لەوەیە بەگوێرەی ڕێسا و بەرنامە ژیان بەسەر بەرێت" بە مەرجێک تەواوی ئەندامانی خێزان ئامادەییان تێدا بێت پابەند بن بە ڕێساکانەوە.

بۆ نموونە؛ منداڵێکی (٧) ساڵانمان هەیە، شەوان خۆی تەڕ دەکات. دایکیشی دەیەوێت لە ڕێگەی دانانی ڕێسایەکەوە ئەم کێشەیە چارەسەر بکات: "لەمەودوا نابێت لە کاتژمێر (٨)ەوە دەم بەریت بۆ هیچ!" چونکە خۆتان دەزانن خواردنەوەی درەنگوەخت، خۆتەڕکردنی شەوانی لێدەکەوێتەوە.

بەڵام ئەگەر ئەندامانی تری خێزان تاکو درەنگانێکی شەو بۆخۆیان چا و شەربەتیان دەخواردەوە و ئەویش لەو لاوە سەیریان بکات، ئەوسا بەوە ناوترێت ڕێسادانان، بەڵکو ئەوە چەوساندنەوە و ئەزیەتدانی ئەو منداڵەیە.

بۆیە ئەستەمە، چاوەڕێی ئەوە بکەیت ئەو منداڵە پابەندی ڕێساکەی دایکی بێت. هەر ئەوەندەی هەستی کرد چاوی دایکی لەسەر نییە، بزانە چۆن خواردنەوەی ناو ساردکەرەوەکە نۆش دەکات.

خۆ ئەگەر لێی بپرسیت بۆچی ڕێساشکێنی دەکەیت و بەو درەنگوەختە شت دەخۆیتەوە، دوور نییە وەڵامێکی لەم جۆرەت بداتەوە: "ئەوە من نیم کە ڕێساشکێنی دەکەم، بەڵکو دایکمە، لە کاتژمێر (٨)ەوە ناهێڵێت من هیچ بخۆمەوە، کەچی خۆی هەر دەمی دەجووڵێت." ئیتر پێویست ناکات هەستیت خۆت ماندوو بکەیت و هەوڵ بدەیت ئەوەی بۆ ڕوون بکەیتەوە کە "ئاخر تۆ شەوان میز دەکەیت بە خۆتدا، بۆیە باش نییە شلەمەنی بخۆیتەوە"، چونکە بەلای گوێیدا دەڕوات. لێکدانەوەی منداڵەکە ئاوەهایە: لەبەر کەموکورتییەکم -کە میزکردنە بە خۆمدا- دەیانەوێت پەراوێزم بخەن و سزام بدەن. خۆ ئاشکرایە، هیچ کەسێک حەز ناکات سزا بدرێت.

ئەو حاڵەتەی لەسەرەوە باسمان کرد، لە ڕوانگەی تیشک خستنە سەر دنیای ناوەوەی منداڵ، لەوپەڕی بایەخدایە. کاتێک دەبینێت کراوەتە ئامانج، دەکەوێتە بەرهەڵستی بەرامبەر ئەو ڕێسایانەی کە تەنها خۆی دەگرێتەوە. ئیتر لێرەوە نائومێدیی دانەرانی ڕێساکە دەست پێ دەکات.

بە شتێک دەوترێت یاسا، کە هەمووان جێبەجێی بکەن. لەو بارەدا منداڵیش هەست بە شکۆ و ڕێزی خۆی دەکات. منداڵ پارچەیەکە لە خێزان، لایەنگری دەبێت. پێی ناخۆشە هەست بکات پەراوێز خراوە، یان مامەڵەیەکی جیاوازی لەگەڵ دەکرێت. لەم ڕووەوە زۆر گرنگە هۆشیاریی ئەوە دروست ببێت کە داوای شتێک لە منداڵەکانمان دەکەین، خۆیشمان جێبەجێی بکەین.

> **زۆر گرنگە لە ڕێگەی "تێگەیشتن و هەستپێکردنەوە"، منداڵەکانمان فێری ڕێساکانی ژیان بکەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ماوەی پێویستیان بدرێتێ، تاکو ئەو زانیارییە نوێیە هەرس دەکەن و لە حیکمەتەکەی تێدەگەن.**

دەتوانین نموونەی زیاتر بهێنینەوە: قسەیەکی بێمانەیە باوکێک خۆی جگەرەی بە دەستەوە بێت، کەچی باسی زیانەکانی جگەرە بۆ کوڕەکەی بکات: "کوڕی خۆم، تۆ چاو لە باوکت مەکە، تازە من فێر بووم!" دەزانن بۆچی بێمانایە؟ ئاخر منداڵانی ئەم قۆناغە لە ڕێگەی چاولێکردنەوە فێری شت دەبن. دەیانەوێت وەک دایک و باوکیان بن، با لەسەر هەڵەش بن.

## ٢- پێویستە ڕەچاوی دۆخی منداڵەکە بکرێت

یەکێکی تر لە کێشە پەروەردەییەکانمان ئەوەیە، کاتێک قسە لەگەڵ منداڵەکانماندا دەکەین، ڕەچاوی حەقیقەت و دنیاکەیان ناکەین. منداڵ شتێک دەکات، کە لە توانایدایە. دروست نییە داوای شتێکیان لێ بکەین، کە لە بەژنوباڵای ئەواندا نییە. بۆ نموونە؛ با وا دابنێین دایکێکی بەڕێز دەیەوێت کچەکەی لەسەر خوێندنەوە ڕابهێنێت، بۆ ئەمەش بەنیازە ڕۆژی چوار کاتژمێر کتێبی پێ بخوێنێتەوە. کچەکەیشی لە (٢٠) خولەک زیاتر ناتوانێت سەرنجی شتێك بدات، دوای ئەو ماوەیە خەیاڵی دەڕوات و سەرنجی پەرت دەبێت. لە وەها بارێکدا، بەکارهێنانی زۆر و فشار خستنە سەری بۆ ئەوەی ٢ کاتژمێر لەسەر یەک بخوێنێتەوە، هەوڵێکە لەگەڵ واقیعی منداڵەکەدا یەک ناگرێتەوە.

## ٣- بەهەرەمەکی فێری ڕێسا نابێت

کاتێک دەمانەوێت فێری یاسا و ڕێسایان بکەین، پێویستە ئەو کاتانە هەڵبژێرین کە ئامادەباشیی فێربوونیان بەرزە. دەنا تووشی بێزاری و ماندوویی دەبێت، ئەگەر لە کاتێکی نەگونجاودا فێری ڕێسا و ڕێوشوێنی ئیش و کارەکانی بکەین.

با بڵێین منداڵەکە ناتوانێت بەجوانی قەیتانی کاڵەکەی ببەستێت، لەولاشەوە دایکی پەلەیەتی بچێت بۆ دەوام. بەتووڕەییەوە پێی دەڵێت: "دەی کچم خێرا بکە، درەنگ کەوتین!" ئەوجا ئەوەندەی تر پەست دەبێت: "ئۆۆۆف... بێزار بووم لەدەست ئەم خاوییەی تۆ! چەند جار پێم وتی وەها نابەسترێت، ئەوها بڕوانە، ئاوەها... بینیت؟" دایکی بەڕێز وا دەزانێت منداڵەکەی فێری قەیتان بەستن کردووە، ئاگای لەوە نییە منداڵەکەی وانەیەکی جیاوازتر فێر بووە: دایکی تووڕە چۆنە؟ چۆن فشار دەخاتە سەر منداڵەکەی؟.

خاڵێکی تری هەستیار ئەوەیە لە ڕێگەی (تێگەیشتن و هەستپێکردنەوە) فێری ڕێساکانی ژیانیان بکەین. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ماوەی پێویستیان بدرێتێ، تاکو ئەو زانیارییە نوێیە هەرس دەکەن و لە حیکمەتەکەی تێدەگەن.

بۆیە لێرەوە ڕووی دەممان دەکەینە ئەو دایکانەی سکاڵای ئەوەیانە ڕۆڵەکانیان درەنگ فێر دەبن یاخود هیچ فێر نابن، تکایە لەپێشدا سەیرێکی خۆتان بکەن، بزانن چی و چۆنیان فێر دەکەن.

ئەگەر دایکان لە لیستێکدا خاڵ بە خاڵی ئەو گرفتانە بنووسن کە لەنێوان خۆیان و منداڵەکانیاندایە، دڵنیاتان دەکەمەوە کە گیروگرفتی منداڵانی ئەم تەمەنە لە ژمارەی پەنجەکانی دەستێک تێناپەڕێت. ئینجا ئەگەر بۆ چارەسەرکردنی هەر گرفتێک یەکی یەک هەفتە دابنێین، ئەوسا لە ماوەی (١٠) هەفتەدا زاڵ دەبن بەسەر (١٠) دانەیاندا، بەڵام بەداخەوە لە ئەنجامی ئەو هەڵانەی لە سەروبەندی فێرکردنی شتێکی تازەدا دێتە ئاراوە، فێرکردنی (١٠) هەڵسوکەوت چەندین ساڵ دەخایەنێت.

**ڕێسا و سنووربەندییەکان چەندە زادەی گفتوگۆی نێوان باوان/منداڵ بن، ئەوەندە ئاسانتر هەرس دەکرێن.**

لەبەر ئەوە، گـرنگە ئاگامـان لەوە بێـت پەلە نەکەیـن لەوەی بەزوویـی فێـری هونەرەکـانی ژیانیـان بکەیـن، چـونکە ئەو کـات و شـوێنەی هەڵـی دەبژێـرین، کـاریگەریی ڕاسـتەوخۆی هەیە لەسـەر پرۆسـەی فێربـوون. لە سـاتەوەختی ڕەخسانی وەها زەمەن و زەمینەیەکدا، بە دەنگی ناسکی دایک دەرگـای ویژدانـی منداڵ دەکرێتەوە و یەکێـک لە ڕێسـاکانی فێـر دەکرێـت. جێـی خـۆیەتی لێـرەدا ئاماژە بە کاریگەریی بێوێنەی (کۆبوونەوەی خێزانـی) بـدەم، لە ڕەخسـاندنی ئەو کەشەی کە تا ئێستا باسی دەکەین.

بە پشتیوانیی خـودا، لە بەشـی سـێیەمدا هەڵوێسـتەیەک لەسـەر بـایەخ و گرنگیـی کۆبـوونەوەی خێزانـی دەکەیـن، چـونکە ئەو جـۆرە دانیشـتنانە لەبارترین شوێنە بۆ فێربوونی ڕێساکانی ژیانی کـۆمەڵایەتی. ئەو منـداڵانەی لە ڕووی ڕۆحییەوە پێگەیشتوون، لە دوای (٤) ساڵییەوە ئاساییە بەشـدارییان پێ بکرێت. گرنگترین تایبەتمەنـدیی ئەم جـۆرە دانیشـتنانە لەوەدایە، گیـانی هەرەوەزی و بڕیـاردانی هـاوبەش لەنێـوان ئەنـدامانی خێزانـدا بەزینـدوویی ڕادەگرێت.

بۆ نموونە؛ یەکێک لە منـداڵەکان داوای لاپتـۆپ دەکـات، لە حـاڵەتێکی ئاوەهادا لەبری ئەوەی دایک و باوکی بەسەرپێی وەڵامـی بـدەنەوە، دەتـوانن مەسـەلەکە حەواڵەی کۆبـوونەوە خێزانییەکەیـان بـکەن: "پێـت چـۆنە لە دانیشـتنەکەی فـلانە ڕۆژدا، قسـەی لەسـەر بکەیـن؟" چـونکە منـداڵان بە گیانێکی بەرپرسیارانەتر مامەڵە لەگەڵ ئەو بڕیـارانەدا دەکەن، کە بەکـۆدەنگی دراوە. ئیتر لەمەوە فێری ئەوە دەبێت، کە هـیچ بڕیـارێکی ئەنـدامانی خێـزان بێبایەخ نییە و ئەوە دەهێنێت کاتی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت.

## ٤- منداڵ حەزی لەوە نییە قەناعەتی پێ بهێنرێت

پێویستە ئەوەش بزانین کە منداڵ مل نادات بـۆ زۆرلێکـردن و حەزی لێ نییە بەزۆر قەناعەتی بۆ دروست بکرێـت. بەس لەبەر ئەوەی شـتێک نەکـات کە قەناعەتی پێی نییە، ئامادەیە پێداگری بکات لەسـەر ڕەفتارێـک کە سوور دەشزانێت هەڵەیە.

گریمان گوڕت بۆ خواردووەتەوە و بەنیازیت ئەم ئێـوارەیە بە (شـێوازێکی قایلکەر) قسـە بـۆ کـچەکەت بکەیـت و ئامۆژگـاریی بکەیـت شـەوان زوو بخەوێت. کەچی دەبینی مل نادات و دەیەوێت چی زووترە خۆی لەو کەشە بـدزێتەوە. بەرهەڵسـتی قسـەکانی بـاوانی دەکـات و دەرگـای گفتوگۆ دادەخات. بۆچی وا دەکات؟ چونکە ڕێسادانان دەبێـت بە چەشـنێک بێت، منداڵ هەست بکات دایک و باوکی لێی تێـدەگەن و دەیانەوێـت گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، نەک شتێکی دیاریکراوی بەسەردا بسەپێنن.

واتە چەندە باوان گوێ لە ڕۆڵەکەیان بگرن و بیـدوێنن، ئەویـش ئەوەنـدە بەئاسانی ڕێساکان قبوڵ دەکات. کاتێک خۆیشی بوو بە دایـک یـان بـاوک، بەدەم چێـژ و خۆشـییەوە منـداڵەکانی فێـری ئەو ڕێسـایانە دەکـات. ئەگینا هەرگیز ئەوە شێوازێکی مرۆڤانە نییە قـۆڵی بگریـت و پەنـجەی لـێ ڕابوەشـێنیت و فەرمـانی بەسـەردا بکەیـت: "بـڕوانە، ئەمە کۆتـا جـارە پێت بڵێم، دووبارەی ناکەمەوە".

منـداڵیش مـرۆڤە، مرۆڤێکـی بچـووکە، مـرۆڤیش لە ڕێـگەی ڕێزدانەوە گۆش دەکرێت.

> **کاتێک منداڵەکەت لە شتێک دەترسێت، قسەیەکی ڕاست نییە پێی بڵێیت مەترسە، هیچ شتێک لەو قسەیەوە فێر نابێت، مەگەر ئەوە نەبێت هەست بە عەیبە و لاوازیی خۆی بکات.**

## ٥- پێویستە ڕێنماکان واقیعی و لەسەرەوە بن

جاری وایە لەناو خێزاندا چاوت بە یاسا و ڕێنمای وا دەکەوێت، کە لە ڕاستیدا بێئەمان و خاڵین لە هەموو ناوەڕۆکێکی مەنتقی. بۆ نموونە: منداڵەکەت شەوان لە تاریکی دەترسێت، هیچ مانایەکی تێدا نییە تۆ پێی بڵێیت: "هیچ پێویست بە ترسان ناکات، من خۆم چاودێریی ژوورەکەی تۆیش دەکەم." مادەم ئەو دەڵێت دەترسم، مانای وایە دەترسێت، بۆیە قسەیەکی ڕاست نییە پێی بڵێیت مەترسە، هیچ شتێکیشی لێوە فێر نابێت، مەگەر ئەوە نەبێت هەست بە عەیب و لاوازیی خۆی بکات.

مادەم یاساکەمان پەلی هاویشت بۆ مەسەلەی هەست، دەمەوێت جەخت بکەمەوە سەر ئەوەی کە هیچ هەستێک لە ڕێگەی پاساوی عەقڵییەوە لەناو نابرێت.

نموونەیەکی تر لەسەر پێویستی واقیعبوونی ڕێنماکان: دایکێک بە منداڵە بچووکەکەی دەڵێت: "کوڕی خۆم، ئەگەر ئاقڵ بیت پاسکیلت بۆ دەکڕم." ئەمە گفتوگۆیەکی هەڵەیە، چونکە لە ڕوانگەی منداڵەکەوە ڕستەیەکی ڕوون و ئاشکرا نییە. وەرن با پێکەوە شی بکەینەوە: بە ڕای ئێوە (ئاقڵبوون) لای منداڵ چی دەگەیەنێت؟ ئایا دەتوانێت بەو جۆرە تێبگات کە گەورەکان لێی تێدەگەن؟ لە دنیای گەورەکاندا ئاقڵبوون واتە بێدەنگ دانیشتن و قڕوقەپ بوون، کەچی لە دنیای منداڵدا وشەیەکی بێ ناوەڕۆک و ئێشێکی بێزارکەرە. لەکاتێکدا ئەوان بەسروشت حەزیان لە هەڵبەز و دابەز و ڕاکەڕاکە، گەورەکان دێن و بە ڕێنمایەکی ناواقیعی دەیانبەستنەوە. بێگومان ئەمەش فێری جۆرێک لە دووڕوویان دەکات؛ وەها خۆت نیشان بدە کە دەوروبەر دەیانەوێت.

## ٦- نابێت جێبەجێکردنی ڕێسایەك ببەسترێتەوە بە مەرجێکی دیکەوە

زۆر جار ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان (لە چ شوێنێکدا، بە چ جۆرێک هەڵسوکەوت بکات) پاڵ بە دایکانەوە دەنێت دایکایەتییەکی (مەرجدار) بکەن. ئەمە لە کاتێکدا چ دایکایەتی، چ خۆشەویستی، نابێت وابەستەی هیچ مەرجێکی دیکە بن. لەبەرامبەر ئەو ڕەفتارانەی دەمانەوێت ئەنجامی بدەن، نابێت چاوەڕێی هیچ شتێکیان لێ بکەین.

لەم دەربڕینەدا: "ئەگەر ئاقڵ بیت، پاسکیلت بۆ دەکڕم." وەک چۆن ناخ و نیازی بێگەردی دایک ڕەنگ ناداتەوە، لە هەمان کاتدا ئەنجامدانی (ڕەفتارێکی دروست)یش بەستراوە بە مەرجێکەوە، کە ئەویش کڕینی پاسکیلە. ئیتر هەر ئەوەندەی جارێک فێری ئەم سەودا و مامەڵەیە بوو، زەرەرمەندی یەکەم دایک و باوک دەبن.

## کۆمەڵایەتیبوون پێداویستییە

یەکێک لە گرنگترین پێداویستییەکانی منداڵی ئەم قۆناغە (٤-٧) ساڵ، کۆمەڵایەتیبوون و تێکەڵاویی کەسانی ترە.

منداڵان ڕێک لەم تەمەنەدا، هەست بە پێویستیبوونی برایەک/خوشکێک دەکەن، کە وەک خۆیان بیر دەکاتەوە و وەک خۆیان هاروهاجی دەکات و بایەخ دەدات بەو شتانەی کە جێی بایەخی خۆیانن.

دەکرێ لە سەرەتادا ئەو کەسە دایک بێت، بەڵام پاش ماوەیەک دایکیش ناتوانێت ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، چونکە منداڵ پێویستی هاوتایەکە، کە خۆی لە ئاوێنەی ڕۆحیدا ببینێتەوە.

منـداڵ لەم تەمەنەدا لەبـری دایـک -کە زۆر لە خـۆی شـارەزاترە- بەدوای هاوتایەکدا دەگەڕێت، کە وەک خۆی کەم دەزانێت و شتێکی لێوە فێر دەبێت و ئەمیش شتێکی فێر دەکات.

لەبەر ئەوە منداڵی ئەم قۆناغە پێویستی بەوەیە بچێتە ناو هاوتەمەنەکـانیەوە و لەگەڵ منداڵی دەرودراوسێدا تێر گەمە و یاری بکـات. پێویسـتە لانـی کەم ڕۆژی (٢)کاتژمێر لەگەڵ منداڵی خزم و دراوسێدا بەسەر بەرێت.

> منداڵانی تەمەن (٤-٧) ساڵ، بەدوای هاوتایەکدا دەگەڕێن کە وەک خۆیان کەم بزانێت و شتێکی لێوە فێر ببن و ئەوانیش شتێکی فێر بکەن.

خاڵێکی تر کە دەمەوێت ئامـاژەی بـۆ بکەم ئەوەیە، منداڵ تـا چەنـد تـێکەڵاوی منداڵان ببێـت و یارییـان لەگەڵ بکـات، ئەوەندە هەست بە پێویسـتیبوونی بـرایەک یان خوشکێک دەکات بۆ خۆی.

کە لەوان جیـا دەبێـتەوە، حەز دەکـات لەگەڵ خوشـــکەکەی/براکەی خـــۆی یاری بکات. کە لێـی زویـر دەبـن یـان یاریی لەگەڵ ناکەن، لە دڵی خۆیدا دەڵێت: "ئەگەر خوشـکێک یـان بـرایەکم هەبووایە، ئێستا لەگەڵ ئەو یاریم دەکرد!" بۆیە جارجار گوێت لێیـان دەبێـت بە دایکیان دەڵێن، خۆزگە منیش برایەکم/خوشکێکم دەبوو. هەر بەڕاسـتیش پێویستیانە.

بەڵام بەشێک لە دایکان لەتاو ئەو ئازار و نارەحەتیانەی بەدەست منـداڵی بەکەمەوە چەشتوویانە، هەر وا ئاسان قایل نابن منداڵێکی تریـان ببێـت. بەوە دڵی خۆیان دەدەنەوە، کە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی منداڵێک لە خستنەوەی چەند منداڵێک باشترە، کە فریای پەروەردەکردنی هیچیان نەکەوێت. بەڵام دوا جار درەخت بە گوڵ و گەڵاکانیەوە جوانە.

منداڵ ئەگەر خوشک یا برای هەبێت، هەست بە بەهێزیی خۆی دەکات لەناو کۆمەڵگەدا. زۆربەی جار ئەو منداڵانەی خوشک و برایان نییە و هەست بە تەنهایی خۆیان دەکەن، دوورەپەرێز و کەنارگیر دەردەچن. ئەمە جگە لەوەی وەچەکانی خۆیشیان مەحکومی هەمان بێکەسی و تەنهایی دەکەن، چونکە منداڵەکانی نە مام، نە خاڵێکیان دەبێت شانازی پێوە بکەن، نە پوورێکیش دڵی پێ خۆش بکەن. لەبەر ئەوە دەبێت دایکان ئەوەیان لەیاد بێت، کە بڕیارەکانیان کاریگەریی لەسەر کوڕ و کچەزاکانیشیان دەبێت.

لە لایەکی ترەوە، لەوە قورستر نییە منداڵێکی تاقانە گۆش بکەیت، چونکە لە قۆناغە جیاوازەکانی گەشەیدا هەموو شتێک لە دایکی چاوەڕێ دەکات؛ دایکی دەچێت بۆ مەتبەخ، ئەویش یەکسەر دوای دەکەوێت، دایکی ماندوو دەیەوێت چاوێک گەرم بکات، لەپەنا سەریەوە دەست دەکات بە گریان... هتد. ئەمە لە کاتێکدا هاتنە دنیای منداڵی دووەم، باری سەرشانی دایک سووکتر دەکات، چونکە لەبری دایکی ئەو دەکات بە هاوڕێی یاری، لەگەڵ ئەودا شەڕ دەکات و لەویشەوە فێری ئاشتبوونەوە دەبێت. بەو شێوەیە خۆی لە ناکۆمەڵایەتیبوون ڕزگار دەکات.

بۆیە دەڵێین دروست نییە دایکان ئەزموونی تاڵی یەکەم منداڵیان بکەن بە پێوەر و بڕیار بدەن چیدی وەچە نەخەنەوە. لەبری ئەوە، دەتوانن لە کاتی خۆیدا کار بۆ ئەوە بکەن ببنە دایکی خێزانێکی گەورە و بەرفراوان. خاڵی جەوهەری لێرەدا بریتییە لە هۆکاری کات، چونکە هەر وەک دەزانین، ئەگەر بڕیاری بوون بە دایک لە کاتی گونجاوی خۆیدا نەبێت، چەندین گرفتی تەندروستی بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

## پەروەردە بە (کردار) لەپێش پەروەردەوەیە بە (گوفتار)

یەکێکی تـر لە تایبەتمەنـدییەکانی منـداڵانی قۆنـاغی تەمەن (٤-٧) سـاڵ ئەوەیە، لە ڕێگەی ڕەفتار (بوون بە نمـوونە و سەرمەشـق)ەوە پەروەردە بکـرێن، نەک قسە و گوفتار. بۆ نموونە؛ دەمانەوێـت منـداڵەکەمان لەسـەر ددانشـتن ڕابهێنین، لەبری ئەوەی هەموو ڕۆژێـک ئاگـاداری بکەیـنەوە و پێـی بڵێـین: "هەموو شەوێک پێش ئەوەی بخەویت دەم و ددانت بشۆ." دەتوانین هەمـوو شەوێک لە کـاتێکی دیـاریکراودا خۆمـان بچیـنە لای دەستشـۆر و بکەویـنە شۆردنی ددانەکانمان. بوون بە سەرمەشق، باشترین ڕێگەیە بـۆ چەسـپاندنی خوو لە ڕۆڵەکانماندا.

هاوشێوەی ئەو نموونەیەی سـەرەوە، دایـکەکە خـۆی بەردەوام خەریکـی درۆکردنە، بەڵام لای دراوسێکانی ڕووی ڕاسـتەقینەی خـۆی دەشـارێتەوە و بەردەوام باسی ڕاستگۆیی و دروستبێژی دەکات. منداڵ بە کامیـان کـاریگەر دەبێـت؛ ڕەفتـارەکەی دایکـی یـان گوفتـارەکەی؟ بێگومـان ڕەفتـارەکەی. غەیبەتکردن و قسەی پاشملەش لەبەر چاوی منـداڵ لە لایەن گەورەکـانەوە، بە هەمان شێوە ژەهرێکی کوشندەیە دەکرێتە ڕۆحی منداڵەوە، بە یەکێکیش لە هۆکارەکانی ترسان لە تێکەڵاویی خەڵکی دادەنرێت.

لەم ڕووەوە پێویسـتە بـاوان زۆر هەسـتیار بـن سـەبارەت بە بەخـراپە باسکردنی کەسانی تر، چـونکە هەمـوو هەڵسـوکەوت و کردارێکیـان دەبێـتە نمـوونە بـۆ ڕۆڵەکانیـان و چـاوی لـێ دەکەن. ئەوجـا لەسـەر ئەو بنـاغەیە، کەسێتیی خۆیان بنیات دەنێن.

# قۆناغی (٧-١٤)ساڵی



بەراورد بە قۆناغی پێشوو، چالاکییە زیهنییەکان (بیرکردنەوە و هەڵسانگاندن و پەیبردن بە پەیوەندیی نێوان ڕووداوەکان)ی منداڵان لەم تەمەنەدا لە ڕاستییەوە نزیکترە. جاروبار ئەمانیش لەنێوان دنیای خەون و خەیاڵ و ڕاستەقینەدا دێن و دەچن. هەندێک جار حەز دەکەن ببن بە کاپتنی فڕۆکە یان شۆفێری تەکسی، هەندێك جاری تریش وەک ئەوەی مژدەی شتێکمان پێ بدەن، دێن بۆ لامان و هەواڵمان دەدەنێ کە دەیانەوێت ببن بە پزیشک یان مامۆستا. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی کە (٧) ساڵیی جێ دەهێڵن، واقیعیتر دەبن، تەنانەت پێویستیان بەوەش نامێنێت لە مێشکی خۆیاندا خەیاڵ بکەن. هەوڵی بەرجەستەکردنی هەموو شتێک دەدەن.

لەبەر ئەوە بەردەوام خەریکی پرسیارکردنن لە باوانیان: "دایە، فریشتەکان باڵیان هەیە؟ "بابە، ئەرێ جنۆکە چۆنە؟" "دایە، هەر بەڕاستی کچی ناو فیلمەکە دەمرێت؟" بۆیە لەم قۆناغەدا چەندە شتەکان بەرجەستە بکات و بەرکەوتنی هەبێت لەگەڵیاندا، لە قۆناغەکانی دواتردا ئەوەندە بەئاسانی مامەڵە لەگەڵ چەمکە بەرجەستەکاندا دەکات.

> **کاتێک منداڵ هەست بە ترس دەکات، پێویستە باوانی لەباوەشی بگرن و دەست بهێنن بە سەریدا و بایەخی تایبەتی پێ بدەن.**

لە (٧) ساڵییەوە ئیتر منداڵ دەکەوێتە لێکجیاکردنەوەی شتە بەرجەستە و

واتاییەکان. لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی بەرچاو تووشی (ترسی شـەوانە) دەبـن. ئیتر وردە وردە ئەو شوێنانە جێ دەهێڵێت، کە لە قۆنـاغی پێشـتردا بە خەیـاڵ بۆیـان دەچـوو. هەر لەو تەمەنەوە قارەمـانی نـاو چیرۆکەکـان لە یەکـتر جیـا دەکاتەوە و دەتوانێت بڕیار بدات کامیان ڕاستەقینەیە و کامیان گاڵتینە.

ڕەنگە هەندێک جار منداڵ نەتوانێت ئەم قۆنـاغە -کە قۆنـاغی دەستاودەسـتی نێوان چەمکە واتایی و بەرجەسـتەییەکانە- بەئاسـانی تێپەڕ بکـات. بـۆ نمـوونە؛ پێویسـتە وەڵامـی ئەم جـۆرە پرسـیارانەی بەڕوونـی دەسـت بکەوێـت: "ئایـا لە ڕاسـتیدا خێـو هەیە؟" و دڵنیـاش ببێـتەوە لەوەی کە هـیچ خێوێـک لەژێـر پێخەفەکەیەوە نایەتە دەرەوە، تاکو بەو جۆرە بتوانێت بـاقیی ژیـانی بەئاسـوودەیی بەسەر بەرێت.

لە ڕاستیدا منداڵی ئەو تەمەنە، بە قۆناغێکی زۆر سروشـتیدا گـوزەر دەکـات. لـێ ئەگەر ئـێمەی پێگەیشـتوو بە شـێوەیەکی حەکـیمانە مـامەڵە لەگەڵ ترسـەکانیاندا نەکەیـن و لە هەسـتیاریی دۆخەکەیـان تێـنەگەین و وەک ئەوەی ئەوەش بەس نەبێت، هەستاین گاڵتەمـان بە ترسـەکانیان کـرد، دەبـێ ئەوەشـمان بەلاوە ئاسایی بێـت گرفتەکانیـان قـووڵتر ببـنەوە و کـاریگەریی نەرێنـی لەسـەر داهاتووشیان دروست بکەن.

لەم قۆنـاغەدا کە ترسـەکانی منـداڵ ڕوو لە زیـادبوون دەکەن، گـرنگترین شت کە دایکان پێی هەستن ئەوەیە، پێگەیشتووانە مامەڵە لەگەڵ حـاڵەتەکەدا بکەن و ئەوەیان بیر نەچێت کە هێشتا منداڵن. مادەم بە دەمـی خـۆی دەڵێـت "دەترسم"، کە وایە دەترسێت. تەنانەت با ترسەکەشی وەک پاسـاوێک بەکـار بهێنێت بۆ ڕاکێشانی سەرنج و بایەخی باوانی، دیسانەوە نابێت دەسـت بنـێن بە ڕوویەوە و بەڕەقـی وەڵامـی بـدەنەوە: "هەسـتە بچـۆ ژوورەکەی خـۆت. ئەوەندە زلی مەکە، هـیچ نیـیە." بەڵکـو دروسـت وایە لە باوەشـی بگـرین و

دەست بهێنین بە سەریدا و، بایەخی تایبەتی پێ بدەین. ئینجا گوێی بۆ بگرین و هەوڵ بدەین لێی تێبگەین: "گیانی دایە، دەترسیت؟" پاشان بەدوای سەرچاوەی ترسەکەدا دەگەڕێین؛ ئەگەر لە تاریکی دەترسا، دەتوانین گڵۆپەکان هەڵبکەین، ئەگەر لە تەنهایی دەترسا، دایکی دەتوانێت لای بخەوێت. گرنگ ئەوەیە پێداویستییەکانی لە کاتی خۆیدا پڕ بکرێتەوە.

لایەنێکی تری ئەم بابەتە کە ڕووی لە دایک و باوکانە ئەوەیە، دەبێت ئاگاداری ئەوە بن لای خزم و کەسوکار و دەرودراوسێ زۆر قسەی لەسەر نەکەن، کە منداڵەکەیان بێ هیچ هۆیەک و جارجاریش بەدرۆوە دەترسێت.

## پرسیارکردن لەبارەی بوونەوەرە نەبینراوەکانەوە

منداڵانی تەمەن (٧)ساڵان، بەزۆری پرسیار لەبارەی بوونەوەرە نەبینراوەکانەوە دەکەن: "فریشتە هەیە؟ ئەگەر هەیە لەکوێ دەژین؟ ئەی بۆچی ئێمە نایانبینین؟" یان ئەو پرسیارە دەکەن، کە زۆرێک لە دایک و باوکان گیریان خواردووە بەدەستیەوە: "خودا لەکوێیە؟"

بەداخەوە، زۆرێک لە دایکان لەبەرامبەر ئەم جۆرە پرسیارانەدا یان دۆش دادەمێنن و بە یەک دوو وشە ڕۆڵەکەیان ڕایی دەکەن، یان هێندە قسەی سەیروسەمەرە دەکەن سەر لە ئەوانیش تێک دەدەن. بۆ نموونە؛ منداڵەکە دەپرسێت: "خودا لەکوێیە؟" لەبەرامبەردا دایکی وەڵامێکی دەداتەوە کە ڕەنگە بۆخۆی واتادار بێت، بەڵام منداڵەکەی دڵی پێی ئاو نەخواتەوە: "خودا لە دڵماندایە." چونکە ئەو دەیەوێت زانیاری سەبارەت بەو شوێنە

> "ئەگەر دایک یان باوک وەڵامی پرسیارێکیان نەزانی، زۆر ئاساییە بڵێن "نازانم". ئەمە ئەوەندەی تر گەورەیان دەکات لەبەر چاوی منداڵەکانیان."

دەست بکەوێت، کە خودای لێیە.

من پێم وایە، پێویست ناکات دایکان بەو چەشنە پرسیارانە خۆیان سەغڵەت بکەن، ئاخر ئەوە پرسیارێکە ئەوانیش وەڵامەکەی نازانن. دایکایەتیی بێگەرد و خۆڕسکیش داخوازی ئەوەیە، قسە لەسەر شتێک نەکەیت کە زانیاریت نییە لەبارەیەوە.

ئەمە جگە لەوەی کە خودی پرسیارەکە خۆی هەڵەیە، چونکە خودای گەورە بەرییە لە هەموو جۆرە شوێن و کاتێک. شوێن و کات دروست کراون، دروستکراویش ناتوانێت پێناسەی دروستکەرەکەی بکات. بۆیە زۆر لە خۆتان مەکەن، بۆ ئەوەی شتێک بڵێن.

لێرەدا خاڵێکی هەستیار هەیە دەمەوێت ڕوونی بکەمەوە: دایکانی بەڕێز، ناچار نین وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بدەنەوە کە منداڵەکانیان ئاڕاستەیان دەکەن، چونکە جاری وایە دایکان هەست دەکەن ناچارن وەڵامیان بۆ هەموو پرسیار و ناڕوونییەک پێ بێت، تەنانەت ئەو شتانەش کە وەڵامەکانیان نازانن. یان جاری وایە وەڵامەکە نازانێت، بەڵام ئەوەندە قسەکانی دەهێنێت و دەبات، سەر لە منداڵەکەی تێک دەدات. ئەگەر شتێکی نەزانی، زۆر ئاساییە بڵێ: "کچی خۆم/کوڕی خۆم، وەڵامی ئەم پرسیارە نازانم." خەمتان نەبێت، وەڵامێکی لەو جۆرە هەرگیز دایک لەبەرچاوی ڕۆڵەکەی بچووک ناکاتەوە، بگرە بەپێچەوانەوە، ئەوەندەی تر مەزنی دەکات.

ئیتر لەوەبەدوا وەڵامی هەر پرسیارێک لە دایکیەوە وەربگرێت دەزانێت کە ڕاست و دروستە، چونکە ئەگەر دایکی شتێک نەزانێت، ڕاشکاوانە دەڵێت: "نازانم".

بەشـێکی زۆر لە دایـک و باوکـان لە ترسـی ئەوەی لەبەر چـاوی منداڵەکانیان ئەرزشیان کەم نەبێتەوە و پێگەکەیان نەلەرزێـت، پەنـا دەبەنە بەر پیتۆڵزانی و یاریکردن بە وشەکان. بۆ منداڵیش هیچی تێناچێـت، هەست بە زۆرلەخۆکردن و ناسروشتیبوونی ڕەفتاری دایک و باوکی بکـات. لە ڕاستیدا هەر ئەوەشە کە شکۆ و پـێگەی بـاوان لە نـاخی منداڵەکەیانـدا دەخـاتە ژێـر پرسیارەوە. ئەوان دەیانەوێت ئێمەی دایـک و بـاوک بـۆ هەمیشـە بەمەزنـی و خاوەن قەدر و شکۆوە لەبەر چاویان بمێنینـەوە، بەڵام ئـێمە دێـین بە دەستی خۆمان ئەمە تێک دەدەین.

ئەم مەسـەلەی لەدەسـتدانی شـکۆیە، بەتـایبەتی لەدوای (٧) سـاڵییەوە ئەوەندەی تر هەستیار دەبێت، چونکە لەم قۆناغەدا بەتەواوەتـی پشتیان بەستووە بە دایک و باوک بۆ فێربوونی هونەرەکانی ژیان؛ کـوڕان چـاو لە باوکیـان دەکەن و کیژانیش دایکیان دەکەنە پێشەنگی خۆیان. بـۆیە ئەگەر بـاوان نەبـنە نمـوونەی سەرڕاسـتی و سەرمەشـقی ڕەوشـتبەرزی، ئەوا دوای خۆیـان یەکەم زیـان بەر منداڵەکانیان دەکەوێت. چونکە بوونەتە پێشەنگێکی ناپەسەند بۆیان.

کاتێک لە ناخی منداڵێکی تەمەن (٧-١٤)دا شکۆ و ئەرزشی دایـک و بـاوک دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، ئیدی شوێنەوارەکەی تەمەنێـک بەزینـدوویی دەمێنێتەوە و بەو چاوەوە تەماشا دەکرێن. بۆیە دەبینیت لە قۆنـاغی هەرزەکاریـدا ئەو دایک و باوکانە خۆیان لەبەرامبەر شـەڕانگێزی و یـاخیبوونی ڕۆڵەکانیانـدا دەبینـنەوە و هەست دەکەن قسەیان ناخوات و کاریگەرییان نەماوە.

## منداڵانی تەمەن (٧) ساڵ سەنگین و سەلار دەبن

(٧) سـاڵی لە ڕوانـگەی گەشـەی منـداڵەوە بە قۆنـاغێکی زۆر گرنـگ دادەنرێـت. چـونکە ئیـتر بـوون بە تـاکی پێگەیشـتوو و هەوڵـی ئەوە دەدەن

خۆیان وا نیشان بدەن کە چیدی گەورە بوون. بۆیە بەلاتانەوە ئاسایی بێت، داواکاریی سەیروسەمەرەیان هەبێت. بۆ نموونە؛ شتێکی چاوەڕوانکراوە کوڕان بە باوکیان بڵێن: "دەتوانم ئۆتۆمبێلەکەت لێ بخورِم؟" یان کچان داوا لە دایکیان بکەن، کە ئەوان نانی ئێوارە ئامادە بکەن. لە ڕاستیدا بەو جۆرە ڕەفتارانە، دەیانەوێت بزانن تا چەند نرخ و بەهایان هەیە و ڕێز لە کەسایەتییان دەگیرێت.

مافی خۆشیانە داواکاریی لەو جۆرەیان هەبێت، چونکە پێیان ناوەتە قۆناغێکی نوێوە و لە ڕووی ڕۆحییەوە جۆرێک لە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە. پێشینان بە منداڵی ئەم تەمەنەیان وتووە (پیاو). بۆیە کە یەکێکیان هاروهاجییەکی کردووە، پێیان وتووە: "کوڕم، پیاو بە." واتە ئێمە پێگەی پیاوبوونمان داوە بە تۆ، دەسا تۆش بەگوێرەی ئەوە هەڵسوکەوتەکانت ڕێک بخە.

بەڵام ئەگەر ئەو پێگەیەی نەدرێتێ کە شایستەیەتی و پێگەیشتن و گەشەی ڕۆحی پشتگوێ خراو و وەک منداڵێکی (٥) ساڵان مامەڵەی لەگەڵ کرا، لەو حاڵەتەدا کۆمەڵە شێوانێک لە ڕەفتار و سلوکیدا سەر هەڵدەدات. لە پێشەکیشیانەوە: درۆکردن و هەڵسوکەوتی ناکۆمەڵایەتی.

## چوونە ناو کۆمەڵەوە

لەگەڵ پێنانە (٧) ساڵییەوە، ئیدی منداڵ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ڕوو لە زیادبوون دەکات، پێویستیشە زیاد بێت. ئیدی دەست دەکات بە تێگەیشتن لەو شتانەی لە دەوروبەری دەگوزەرێت، حەز دەکات وەک کەسێکی پێگەیشتوو تێڕوانینی خۆی هەبێت. ئەرکی دایک و باوک بەرامبەر ئەم

گۆڕانکارییە گرنگە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە ئەوانیش بەبایەخەوە تەماشای مەسەلەکە بکەن و پێویستی بە هەر زانیارییەک بوو بیخەنە بەر دەستی.

بۆ نموونە؛ کوڕان پێیان خۆشە قسە لەسەر سیستمی کارگێڕیی وڵات بکەن. حەز دەکەن ئاگاداری بۆچوونی کاربەدەستانی وڵات و سیاسییەکان بن. هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەری قوتابخانەکەیان هەڵدەسەنگێنن و قسەی خۆیان هەیە لەبارەی چۆنێتیی بەڕێوەبردنەوە.

لەبەرامبەردا، کچانیش بۆچوونی خۆیان هەیە سەبارەت بە هاوڕێکانی دایکیان. ڕەنگە گوزارشت لە بێزاریی خۆیان بکەن بەرامبەر هەندێ کەس، یان هاوشێوەی کەسێکی گەورە شیکاری بەسەرهاتی دراما تەلەڤزیۆنییەکان بکەن. لە هەندێ باری دیکەشدا، حەز دەکەن ڕای خۆیان دەرببڕن سەبارەت بەو شوێنەی بڕیارە بەخێزانی بۆی بچن.

هەموو ئەو شتانەش بۆیە دەکات، چونکە دەیەوێت بە چاوی خۆی ببینێت کە لەناو خێزانەکەیدا پێگەیەکی هەیە و حسابی بۆ دەکرێت. بۆیە زۆر گرنگە دایکان نەڵێن کەی کاتی ئەو شتانەیەتی، جارێ منداڵە. دایک و باوکی هۆشیار لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانن مەرج نییە قسەکانی دروست بێت، بەڵام دیسانەوە تەریقی ناکەنەوە و بە چاوێکی سووکەوە ناڕوانن بۆ بیرکردنەوەکانی. بگرە لەوە زیاتریش دەکەن؛ هەموو داواکاری و پێشنیارێکی بەهەند وەردەگرن و کاتی بۆ تەرخان دەکەن و لەناو کەشێکی پڕ (گفتوگۆ)دا تاووتوێی دەکەن. لێرەدا بەمەبەست وشەی گفتوگۆم خستووەتە ناو کەوانەوە، چونکە هەندێك کەس پێیان وایە گەورە چیی وت، دەبێت منداڵ ملکەچی بێت و باوەڕی پێ بهێنێت.

> **منداڵی ئەو دایک و باوکانەی فشار بەکار دەهێنن، بۆ پاراستنی شکۆ و کەسێتیی خۆیان، پەنا دەبەنە بەر درۆکردن.**

لە ڕاستیدا منداڵ بایی ئەوەندە ئەقڵی پێگەیشتووە، کە بزانێت دایکی زۆر زیاتر لە خۆی دەزانێت. بۆیە پێویست ناکات خۆت ماندوو بکەیت و بکەویتە پێشبڕکێی زانیاری لەگەڵی، بەس لەبەر ئەوەی بیسەلمێنیت تۆ زیاتر دەزانی! هەوڵدان بۆ ئەوەی لە ڕێگەی پوچەڵکردنەوەی بیرۆکەکانی بێدەنگی بکەیت، هیچت دەست ناخات.

بەڵام بەداخەوە، بەشێک لە باوان ڕۆڵەکانیان تەریق دەکەنەوە و چەوتی و بێ ناوەڕۆکیی بیرکردنەوەکانیان دەدەنەوە بە ڕوویاندا، کە ئەوەش تا بڵێی ڕەفتارێکی نەخوازراوە، چونکە ئەو تازە بە خۆی و هەگبەی سنوورداریەوە، هەنگاو دەنێتە ناو ژیانی کۆمەڵایەتییەوە. بۆیە زۆر گرنگە سەرنج بخەینە سەر هەنگاوە دروستەکان، تاکو بڕوا و متمانەی بە خۆی بۆ دروست ببێت، دەنا هەست بە فشار دەکات و بۆ بەرگریکردنیش لە خۆی، پەنا دەباتە بەر درۆکردن.

## درۆکردن و منداڵی ئەم قۆناغە

ڕێز و بەها و شکۆ، بەنرخترین سەرمایەی ئادەمیزادە. هەموو مرۆڤێکی دەروون تەندروست، لە ڕێگەی کۆمەڵە پەرچەکردارێکەوە ئەم خەسڵەتانەی دەپارێزێت. بۆ نموونە؛ ئەگەر یەکێکمان هەستی کرد بە قسە هێرشی دەکرێتە سەر، ڕاستەوخۆ دەکەوێتە بەرگریکردن، هیچ دوور نییە ئەویش نەکەوێتە هێرش بۆ سەر بەرامبەر.

**منداڵان ناتوانن بە جارێک هەموو ڕەوشتە جوانەکان لە خۆیاندا پیادە بکەن، پێویستە پەلەیان لێ**

منداڵیش بەدەر نییە لەم حاڵەتە، ئەویش ئەگەر هەست بکات هەڕەشەی لەسەرە، دەچێتە سەنگەری بەرگرییەوە و پارێزگاری لە

کەسایەتییەکەی دەکات. بۆ نموونە؛ ئەرکی ماڵەوەی لەسەرە، بەڵام ئەو ڕۆژە سەری ناوەتە یاری و ئاگای لە دنیا نەماوە. لای ئێوارە دایکی دەیەوێت بزانێت ئەرکەکەی تەواو کردووە یان نا. ئەگەر دایکەکە خاوەن مەزاجێکی توند و کامڵخواز بێت و ئەگەری تووڕەبوونی هەبێت، لە وەها بارێکدا لەپێناو پاراستنی شکۆ و بەهای خۆیدا، جگە لە درۆ پەناگەیەکی تری بۆ نامێنێتەوە هانای بۆ بەرێت.

دایکی بانگی دەکات: "ئادەی ڕۆڵە ئەرکەکانی ماڵەوەت بێنە، بزانم تەواوت کردووە." منداڵی بەستەزمانیش ترسی ئەوەی هەیە ئەگەر ڕاستییەکی بڵێت کەشەکە دەشڵەقێنێت، بۆیە ڕێکوپێک دەڵێت: "دایە ئەمڕۆ ئەرکی ماڵەوەمان نەبوو."

پێدەچێت ئەو دایکە لەتاو پەرۆشیی ئەوەی منداڵەکەی بە باشترین شێوە پەروەردە بکات، ئاگای لەوە نەبێت کە هەوڵ دەدات کوڕەکەی/کچەکەی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. بۆیە هەر هەڵەیەکی لێ دەبینێت یەکسەر بەڕەقی ئاگاداری دەکاتەوە، نەبادا جارێکی تر دووبارەی بکاتەوە. بە بۆچوونی خۆی، منداڵەکەی بەو جۆرە لە وانەکانیدا سەرکەوتوو دەبێت. ئەی ڕەچاوکردنی هەست و لایەنی دەروونیی منداڵ کوا؟ بەداخەوە، ئەوان بوون بەژێر چەندین شتی لاوەکیی ترەوە.

لە لایەکەوە دایکی پەرۆش لە هەوڵی ئەوەدایە دایکایەتییەکی نموونەیی بکات، کەچی لەولاوە منداڵەکەی بە مەبەستی ڕزگاربوون لەژێر فشاری دایکی و پاراستنی شکۆی خۆی، پەیتا پەیتا درۆ دەکات. چۆن درۆ ناکات لە کاتێکدا ئەو بەستەزمانە شتەکانی لێ ئاڵۆسکاوە. لەوەش ناحەقتر نییە بەتەما بیت سەرباری هەموو زۆڵێکردن و فشارەکانی سەری، هێشتا پابەندبێت بە ڕاستبێژییەوە. ئەوە با لەولاوە بوەستێت کە ڕازیبوون بە وتنی ڕاستی لە وەها

دۆخێکدا، خۆی لە خۆیدا ئاماژەیە بۆ بوونی گرفتی تر. چونکە ئەگەر سوور بزانێت بە درکاندنی ڕاستی دەکەوێتە ژێر فشارەوە، کەچی هێشتا هەر بیشیلێت، مانای وایە باری سەرشانی گەلێک گرانە. لەو کاتەدا کە درۆ دەکات، ئەو ترسەشی کە هەیە سزا بدرێت لەسەری. بەڵام ئەو لەنێوان دوو هەڵبژاردەدا گیری خواردووە؛ خەمی ئەوەیەتی ئەگەر درۆکەی کەشف ببێت، خۆشەویستیی دایک و باوکی لەدەست بدات، لەولاشەوە خەمی ئەوەیەتی ئەگەر ڕاستی بڵێت، کەسێتییەکەی زامدار دەکرێت.

هەڵەیە بگرە زوویشە، ئەگەر لەو تەمەنەوە چاوەڕێی پێگەیشتنی ئەخلاقییان لێ بکەین. چونکە تازە چووەتە ناو قۆناغی گەشەی ئەخلاقییەوە. لەبەر ئەوە ناکرێت بەتەمای ئەوە بین دەمودەست کامڵ بن و پەیڕەوی بنەما ڕەوشتییەکان بکەن. پەروەردەی ڕەوشت پێش هەموو شتێک پێویستی بە کاتە، چونکە سەرەکیترین پێکهێنەری ئەم پرۆسەیە بریتییە لە (قەناعەتی ویژدانی). قبوڵکردنی زیهنی ڕێسا و بنەما ئەخلاقییەکان، شتێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت. ڕەگ داکوتینی بنەماکانی ڕەوشت و بەها باڵاکان لە دڵ و دەروونی منداڵدا، پێویستی بە کاتە.

یەکێکی تر لەو هەڵانەی دایکان تێی دەکەون ئەوەیە، زیادەڕەوی دەکەن لە کاردانەوەکانیان، کاتێک دەبینن منداڵەکەیان شتێک دەکات کە لە بازنەی ڕەوشتدا جێگەی نابێتەوە. لە کاتێکدا هەرسکردنی بنەما ئەخلاقییەکان ویستی ئەوەیە، گەورەکان ئەوەندە پێگەیشتوو بن دەرفەت بدەن بە ڕۆڵەکانیان هەڵە بکەن. بە هەڵەیەک یان دووان دنیا کۆتایی نایەت، بەڵام بەکارهێنانی زەبر و هێزی لەڕادەبەدەر لەبەرامبەر هەڵەیەکدا، ڕەنگە کۆتایی بە زۆر شت بهێنێت.

لەدوای (٧) سالییەوە، ئیتر دەتوانین دەست بکەین بە فێرکردنی ئەو ڕێسا و بنەما ئەخلاقییانەی کە لە کۆمەڵگەدا پەسەندن. تا ئەو تەمەنە ئاشنای هەندێک لە بنەماکان بووە، بەڵام دیارترین تایبەتمەندیی ئەم قۆناغە ئەوەیە، لە ڕێگەی ئەقڵ و لۆژیکیشەوە ئەو بنەمایانە قبوڵ بکات. واتە لە قۆناغی پێشتردا لە ڕێگەی بینینی باوان و لاساییکردنەوەیان فێری ڕێسا ئەخلاقییەکان دەبوو، بەڵام لە ئێستادا پێویستی بەوەیە لە حیکمەت و مەبەستی پشت ئەو شتانە تێبگات، کە داوای لێ دەکرێت پەیڕەویان بکات.

کاتێک لەم ڕوانگەیەوە سەیری مەسەلەکە دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە چوونە ناو ئەم قۆناغە لە ڕووە خێزانییەکەشەوە لەوپەڕی گرنگیدایە. منداڵ لە لایەکەوە فێری ئەوە دەبێت درۆکردن بۆچی خراپە، لە لایەکی تریشەوە کۆشش دەکات بۆ ئەوەی خەسڵەتی درۆنەکردن بکات بە ئاکارێکی چەسپیو لە خۆیدا. لەو نێوەندەشدا پێویستە باوان دەرکێکی گشتگیریان هەبێت بۆ دۆخەکە و بەرگی سنگفراوانی و لێبووردەیی بپۆشن و هەلی بۆ بڕەخسێنن هەنگاو بە هەنگاو پڕۆسەکە تێبپەڕێنێت.

بەڵام ئەوەندەی ئێمە بەر چاومان دەکەوێت، دایک و باوکان خوازیارن لەپڕێکدا کوڕەکەیان یان کچەکەیان ببێت بە سونبولی ڕاستگۆیی و ڕەوشتبەرزی، دنیایان لێدێتەوە یەک ئەگەر ببینن هەڵەیەکی کردووە. بەڵام خۆ ئەوە ڕاستییەکە کە بنەماکانی ڕەوشت بە شێوەی پلەبەندی لە ناخدا جێگیر دەبن، بە جارێک هەمووی فێر نابێت. وەک یەکەم هەنگاو، ئەوە لە ناخیدا دەچەسپێت کە درۆ نەکات. پاشان لە دزێویی دزیکردن تێدەگات و ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە بە شەڕ و دەمەقاڵێ کێشەکان چارەسەر نابن. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوەمان لەبەر چاو بێت، کە مەرج نییە هەرچی فێر بوو یەکسەر

جێبەجێی بکات و ببێت بە بەشێک لە ناسنامەی کەسێتییەکەی، چونکە ناسنامەی کەسێتیی مرۆڤ لەدوای بیستەکانەوە جێی خۆی دەگرێت.

## هەرزەکاریی بەرایی

لەدوای حەوت ساڵییەوە، هاوشانی بەرەوپێشچوونی گەشەی زیهنی و فێربوونی ڕێسا ئەخلاقییەکان، وردە وردە منداڵ پێ دەنێتە قۆناغی هەرزەکارییەوە. وێڕای ئەوەی هێشتا سیمایەکی منداڵانەیان هەیە، کەچی هەر وەک ئەوەی خاوەنی جەستەی کەسێکی پێگەیشتوو بن، باڵایان درێژ دەبێت و سمێڵیان سەر دەردەکات و کچانیش ڕواڵەتی کیژی پێگەیشتوو نیشان دەدەن. هەموو ئەو ئاماژانە پێمان دەڵێن کە لەبەر دەرگای هەرزەکاریدان، بەڵام جارێ نەچوونەتە ژوورەوە.

پێویستە دایکان ئەو ماوەیە وەک قۆناغی خۆئامادەکردن بۆ هەرزەکاری ببینن. لەو بڕوایەدا نیم قۆناغێکی تر هەبێت لە ژیانی مرۆڤدا، بە ئەندازەی قۆناغی هەرزەکاری پڕ مەتەڵ و ئاڵۆسکاوی بێت و ئەوپەڕی وردبینی و هەستیاری بخوازێت لە باوان.

# تەمەنی (١٤-٢١) ساڵی: قۆناغی هەرزەکاری



لە سەرچاوە زانستییەکاندا قۆناغی هەرزەکاری بەوە پێناسـە دەکرێت، ی بــریتییە لە ســەرهەڵدانی کــۆمەڵە گۆڕانکــارییەکی خێــرا لە (دەروون) و (جەستە)ی مرۆڤدا، لە ئەنجامی دەردانی کۆمەڵە هۆرمۆنێکەوە.

هەرزەکــاری، قۆنــاغی تێپەڕبــوونە لە بەرائەتــی منــداڵییەوە بەرەو ڕۆحیەتــی پێگەیشتوو. وەک لە بڕگەکانی پێشەوەشــدا باســمان کــرد، هەرزەکــاری هەروا لەناکاو دەست پێ ناکات، بەڵکو سەرەتا منــداڵ دەچێــتە قۆنــاغی (هەرزەکــاریی بەرایی)یەوە، کە هاوکاتە لەگەڵ تەمەنی (٩ - ١٠) ساڵیدا.

کوڕان بەژن و باڵایان درێــژ دەبێــت، بەڵام لە ڕووی زیهنیــیەوە هێشــتا هەر بە منداڵ دادەنرێن. کچانیش لە ڕووکەشــدا دەڵێــی کیژێکــی گەنجــن، بەڵام تــا ئەو کاتەش بە ڕەفتارە منداڵانەکانیان هەمووان تووشی سەرسوڕمان دەکەن.

ڕێــک دوابەدوای ئەم مــاوەیە -هەرزەکــاریی بەرایــی- منــداڵ وەک ئەو فڕۆکەیەی لــێ دێــت کە هاوســەنگی لەدەســت داوە؛ لە ڕووی ســۆزدارییەوە دوچاری چەندین هەوراز و نشــێو دەبێــت، ســەری لێــدێتەوە یەک، نازانێت چی و چۆن بکات. لە ڕاستیشدا ئەمە شتێک نیــیە جێــی سەرســوڕمان بێت، چــونکە ئەوە یەکەم جــارە گۆڕانکــاریی هۆرمــۆنی لەو جــۆرە لە پێکهــاتەی جەستەیدا ڕوو بدات.

ئەم هەستیارترین قۆناغەی هەرزەکاری، بە شێوەیەکی گشتی لە کچاندا لەنێوان (١٠ - ١١) ساڵی و لە کوڕانیشدا لەنێوان (١٢ - ١٣) ساڵیدا سەر هەڵدەدات. شایانی باسە ئەم هەژانە دەروونییە لە بیست ساڵی بەدواوە هێور دەبێتەوە و خۆی دەگرێت. گیروگرفتەکانی هەرزەکاری بەزۆری لە ساڵەکانی سەرەتای قۆناغەکەدایە، بۆیە لە ساڵەکانی دواتردا زۆر کەس پێیان وایە ئیدی ئەو منداڵە هەرزەکاریی تەواو کردووە، ئەمە لە کاتێکدا هەرزەکاری تاکو دوای بیست ساڵیش شوێنەواری هەر دەمێنێت.

## کوڕان هەستی تاوانبارییان تێدا دروست دەبێت

جا سەیر لەوەدایە کە کوڕان دەچنە هەرزەکارییەوە، هەستی تاوانباری زاڵ دەبێت بەسەریاندا. ئێستا با بپرسین: کەسی تاوانبار بە شێوەیەکی گشتی چۆن هەڵسوکەوت دەکات؟ کاردانەوە دەنوێنێت بەرامبەر هەر شتێک کە ئاڕاستەی دەکرێت. ئەگەر بە کوڕێکی هەرزەکار بڵێیت: "لەسەروو چاوەکانتەوە برۆ هەیە." ئەوا یەکسەر دێت بەگژتدا و دەیکات بە مشتومڕی بێمانا لەگەڵت.

یەکێکی تر لە دیارترین خەسڵەتەکانی ئەم قۆناغە لای کوڕان، دابڕانیانە لە باوکیان. باوکی دڵمیهرەبان دەیەوێت دەستێک بهێنێت بە سەری کوڕە خۆشەویستەکەیدا، کەچی ئەو سەری لا دەبات. دەڵێ وەرە لەلام دابنیشە، بەڵام ئەو زیاتر دوور دەکەوێتەوە. باوکان بەم ڕەفتارانە زۆر تێک دەچن، بۆیە بەردەوام سکاڵایانە لەدەستیان. کەچی خۆی لە ڕاستیدا

> **کوڕان کە دەچنە هەرزەکارییەوە، هەستی تاوانباری زاڵ دەبێت بەسەریاندا. کەسی تاوانبار چۆن هەڵسوکەوت دەکات؟**

بەئەنقەست وا ناکەن و هیچ نیازێکی خراپیان نییە بەرامبەر باوکیان، مەسەلەکە ئەوەیە بە هەژانێکی دەروونیدا تێدەپەڕن. بۆیە زۆر گرنگە باوکان بە کارزانی و ئارامگرییەوە بڕواننە هەڵسوکەوتی کوڕەکانیان و لێیان نەگرن، با خەمیان نەبێت، حاڵەتەکە کاتییە و گوزەر دەکات.

## کچان پێویستیان بە دایکیانە

کچان بەپێچەوانەی کوڕانەوە، نە هەست بە تاوانباری دەکەن، نە لە خێزانەکەشیان دادەبڕێن. ئەوان زیاتر پێویستیان بە دایک یان خوشکە. دەزانێت کە بەرەو پێگەیشتن دەڕوات، بۆیە سەلار و سەنگینانە هەڵسوکەوت دەکات. حەزیان لێیە تێکەڵی کۆڕی هاوڕێ و ناسراوەکانی دایکیان ببن - وەک ئەوەی هاوتەمەنیان بن- و وەک ئەوان ڕەفتار بکەن.

خوازیارن چیتر وەک تاکێکی پێگەیشتوو مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت. بایەخی گفتوگۆی نێوان دایک و کچ لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. لە حاڵێکدا ئەگەر دایک پێگەی (خانمی تازەپێگەیشتووی) پێ نەبەخشێت و بەناسکی لەگەڵی نەجووڵێتەوە، ئەوکات ئەو کیژە بەمە نیگەران و تووڕە دەبێت و هەوڵ دەدات بەزۆر ئەو پێگەیە بۆ خۆی بپچڕێت.

هاوکات ئەم قۆناغە لە ڕوانگەی کرانەوە بە ڕووی دنیای دەرەوە و بەدەستهێنانی تێڕوانینێکی جیاواز سەبارەت بە خود، بە دەرفەتێکی باش دادەنرێت. لە ئەنجامی ئەوەشدا دوور نییە بایەخێکی زیاتر بدات بە دۆست و هاوڕێکانی وەک لە خێزانەکەی، بەڵام ئەمە بە هیچ شێوەیەک مانای ئەوە نییە کە ڕقی لە خێزانەکەی بێت، یاخود بیەوێت لێیان دابڕێت. تەنیا ئەوەندە هەیە کە چێژ دەبینێت لە هاوڕێیەتی و کاتبەسەربردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا، کە لەدەرەوەی خێزانەکەی -واتە هاوڕێکانی- ناسیونی.

جاری وایشە دوورکەوتنەوە و دابڕانی منداڵی هەرزەکار لە ماڵ، هۆکارەکەی ئەوەیە دەترسێت ڕەخنەی لێ بگیرێت. گرنگ ئەوەیە لێرەدا بزانین ئەم دابڕانە دابڕانێکی فیزیکی و جەستەییە، سۆزداریی نییە. بەڵام بەردەوامبوونی دایک و باوک لەسەر تەریقکردنەوە و شکاندنەوەی، سەر دەکێشێت بۆ ئەوەی لە ڕووی سۆزداریشەوە ئەو منداڵە خۆی لە خێزانەکەی دابڕێت.

## منداڵی هەرزەکار بەرگەی ڕەخنە ناگرێت

لە کاتێکدا هەرزەکار لەناو ئەو گۆڕانکارییە خێرایانەدا ڕۆچووە، کە لە جەستە و باری دەروونیدا هاتوونەتە ئاراوە، ئەگەر دایک و باوکی داوای کۆمەڵە شتێکی لێ بکەن کە لە دنیاکەیەوە دوورە، شتێکی چاوەڕوان کراوە تووڕە ببێت و هەڵبچێت. بەلای منداڵی هەرزەکارەوە لەوە ناخۆشتر نییە هەست بکات باوانی لێی تێناگەن، ئەمە ئەوەندەی تر باری دەروونیی قورستر دەکات.

لە ڕاستیدا ئەوە منداڵانی هەرزەکار نین کە سەرچاوەی نانەوەی پشێوی و گیروگرفتن، بەڵکو ئەوە دایک و باوکانن کە لێیان تێناگەن. زۆربەی جار دەستنوقاوی دەنوێنن لە پێدانی ئەو پێگەیە بە ڕۆڵەکەیان کە تەمەنەکەی/قۆناغەکەی داخوازیەتی. ئیتر ئەو منداڵ نییە، بەڵکو تازەپێگەیشتوویەکە کە هەنگاوێک دواتر دەبێت بە کەسێکی پێگەیشتوو. بۆیە هەرگیز دروست نییە پێشتر چۆن مامەڵەی لەگەڵ کراوە، ئێستاش بە هەمان جۆر مامەڵەی بەرامبەر بنوێنرێت. ئەوان ئیتر (خانم) و (کاک)ن.

> **ئاستی هۆشیاریی خێزان، گەورەترین هۆکاری تێپەڕاندنی هەرزەکارییەکی بێ کێشەیە.**

## لە هەموو ئانوساتێکدا بۆی هەیە لە شیرازە دەربچن

لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگۆڕە جۆراوجۆرانەی بەسەر منداڵی هەرزەکاردا دێت، هەر ڕۆژە و بە شێوەیەک دەیانبینیت. ئەمڕۆ دەیبینیت بووە بە (پیاو) و بەشداریی کۆڕی پیاوماقوڵان دەکات، کەچی سبەینێ دەیبینیت لە کۆڵان وەک منداڵ یاری دەکات. لەبەر ئەوە نابێت بکەوینە ئەو گومانەوە کە دنیای پڕ شەپۆلی هەرزەکار ئۆقرە دەگرێت و لەسەر بارێک دەگیرسێتەوە.

منداڵی هەرزەکار هەر وەک ئەو نەخۆشە وایە کە تازە لە نەشتەرگەری هاتووەتە دەرەوە، هەموو ئانوساتێک بۆی هەیە میکرۆباوی ببێت. بۆیە بە چ شێوەیەک ڕەچاوی پاکژیی ئەو ژینگەیە دەکەین کە نەخۆشی تێدایە، پێویستە بەو شێوەیەش گرنگی بەو ژینگەیە بدەین کە هەرزەکاری تێدا دەژی. دایک و باوک ساڵەهای ساڵ شەونخونی دەکەن و ڕەنجیان لەگەڵ دەکێشن، کەچی لە هەرزەکاریدا هەر ئەوەندە دەزانی یەکێکی تر میکرۆباویی کردووە. بۆ نموونە؛ سەرسامی هەڵسوکەوت یان نیگای هونەرمەندێکی سینەمایی دەبێت. دەبینی جگەرە دەکێشێت، ئەمیش حەز دەکات لاسایی بکاتەوە و وەک ئەو خۆی بنوێنێت. ڕەفتار و گوفتاری، تەرزی پۆشین و هەڵسووڕانی بە چەشنێک ڕێک دەخات، کە لە هەموو شتێکدا بچێتەوە سەر ئەو.

یەکێک لە گەورەترین ئەو مەترسیانەی ڕووبەڕووی خانەوادەی خاوەن هەرزەکار دەبێتەوە بریتییە لە بە سەرمەشقوەرگرتنی پیشەنگی پەسەند یان پێچەوانەکەی؛ پێشەنگی ناپەسەند. لەبەر ئەوە پێویستە دایک و باوکان لەوپەڕی ئاگاییدا بن سەبارەت بەوەی کوڕەکەیان/کچەیان لەگەڵ کێ هەڵدەستێت و دادەنیشێت، هاوڕێیەتیی کێ دەکات، لە ماڵی هاوڕێکەی تەماشای چ فیلم و درامایەک دەکات، کێی کردووە بە نموونەی باڵای خۆی.

گرنگترین ئەرک کە لێرەدا دەکەوێتە ئەستۆی باوان ئەوەیە، منداڵەکانیان تێکەڵی منداڵی ئەو خێزانانە بکەن کە هاوشێوەی خۆیان هەستیارییان سەبارەت بەم جۆرە بابەتانە هەیە و زەمینەی ئەوە فەراهەم بهێنن فێری ڕەوشتی جوان ببن لە یەکترەوە.

## هەرزەکاری قۆناغی سەرهەڵدانی گیروگرفت نییە

خۆی لە بنەڕەتدا قۆناغی هەرزەکاری سەرچاوەی سەرهەڵدانی گرفت و کێشە نییە. بە وێنەی نەخۆشیی شەکرە، کە خۆی لە خۆیدا نەخۆشییەکی بەرجەستە نییە. ئەوەندە هەیە جەستەی مرۆڤ ساز دەکات بۆ سەرهەڵدانی نەخۆشیی تر. ئەگەر ڕەچاوی کۆمەڵە ڕێسا و بەرنامەیەکی دیاریکراو نەکرێت لە بابەتی خۆراکدا، ئەوسا چەندین شوێنی جەستە هاواریان لێ بەرز دەبێتەوە و گرفتار دەبن. قۆناغی هەرزەکاریش وەهایە، ئەگەر وریا نەبین، لەوانەیە چەندین شوێنەواری نەرێنی لە ناسنامە و بنیاتی کەسێتییەکەیدا سەر هەڵبدات. لە باری ئاساییدا ئەو هەڵسوکەوتانەی منداڵ لەم قۆناغەدا فێریان دەبێت کاتین، بەڵام دەرەنجامی کارلێکی ناتەندروستی نێوان باوان/منداڵ، ڕەنگە پێداگرییان لەسەر بکات و بیانکات بە خوو. هەر ئەوەندەش نا، بگرە کۆمەڵە هاوڕێیەک بۆ خۆی دەدۆزێتەوە کە ئەوەندەی تر ئەو ڕەفتارە ناپەسەندانەی تیادا تۆخ دەکەنەوە. بەو شێوەیە، هەنگاو بە هەنگاو بناغەی زنجیرە گرفتێک دادەڕێژرێت، ئەگینا سروشتی هەرزەکاری گرفتاوی نییە. لەم ڕوانگەیەوە، دەبێت دایک و باوکان چاوکراوە بن سەبارەت بەو میکرۆبانەی کە لەدەرەوە دێن و جەستەی منداڵەکانیان دەکەن بە مۆڵگەی خۆیان. هەروەها پێویستە نیگەران نەبن کە کۆمەڵێك ڕەفتاری نەشیاویان لێ دەبینن" چونکە کاتین و بە تێپەڕبوونی کات نامێنن. با ئەوەش

بڵێین کە پەنابردنە بەر بەکارهێنانی زەبر و هێز، هەرگیز بە ڕێگەچارەیەکی تەندروست دانانرێت بۆ بنەبڕکردنی ئەو هەڵسوکەوت و ئاکارە ناپەسەندانەی کە وا هەست دەکەین منداڵەکەنمان خوویان پێوە گرتووە.

یەکەمین و بنچینەیترین مەرج بۆ تێپەڕاندنی تەندروستانەی ئەم قۆناغە، بریتییە لە هۆشیاربوونەوەی خێزان. بۆ نموونە؛ ئەو دایکەی کە منداڵی هەرزەکاری هەیە، پێویستە زانیاریی دروستی هەبێت لەبارەی ئاڵوگۆڕە جەستەیی و دەروونییەکانی قۆناغەکە و بزانێت منداڵەکەی هەست بە چی دەکات و پێویستی بە چییە. لە چەند دێڕی دواتردا، بە مەبەستی بەرچاوڕوونی زیاتری دایک و باوکانی ئازیز، کۆمەڵە پێشنیارێک دەخەینە ڕوو:

## ١- کۆمەڵە چالاکییەك ڕێك بخەن، کە بواری وەڵامدانەوەی خواستە جەستەییەکانی کەم بکاتەوە

گەورەترین کێشەی هەرزەکاران، ئەو ترس و نیگەرانییەیە کە سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی جەستەیان بۆیان دروست دەبێت. بۆیە باشترین شت ئەوەیە هەستیت بە ڕێکخستنی کۆمەڵە چالاکییەک کە دووری بخاتەوە لە ڕۆچوون لە جەستەیدا و سەرنجی بۆ لای شتی تر ڕابکێشێت. بێگومان یەکێک لە بەسوودترین ئەو چالاکیانەش، وەرزشکردنە.

بەڵام لێرەدا خاڵێک هەیە پێم خۆشە زیاتر لەسەری بوەستین: زۆر جار دەبینم ئەو خێزانانەی کە منداڵی باڵاکورتیان هەیە، منداڵەکەیان دەخەنە خولی باسکە و باڵەوە، ئەمە چییە! دەیانەوێت تۆزێک باڵای بەرز بێت. یان کە منداڵەکەیان کەمێک کێشی زیادە، بەشداری خولی تۆپی پێ یان کاراتێ پێ دەکەن. من وەک خۆم، ئەم جۆرە هەڵبژاردنانە بۆ منداڵی هەرزەکار بە گونجاو نابینم. ئەو خۆی هێشتا خۆشحاڵ نییە بە لەشولاری و لە هەوڵی ئەوەدایە بە

جەستەی ڕابێت، کەچی لەبەر ئەوەی باڵای کورتە دەینێریتە خولی باسکەوە، کە ئەگەری زۆرە کێشەکانی قووڵتر بکاتەوە. ئەی ئەگەر هاوڕێکانی تیمەکەی لەبەر ئەوەی باڵای کورتە و جوان یاری ناکات لێی ڕازی نەبوون، ئەوکات چی؟ مەگەر خۆی تاوانبار ناکات و لە ناخی خۆیدا ناڵێت: "جا بۆ تا ئێستا من چ شتێکم بەجوانی کردووە!" ئاشکرایە ئەو چالاکییانەی لە سەرقاڵبوون بە خۆیەوە دووری دەخەنەوە، تەنیا چالاکیی جەستەیی وەک وەرزش نین، بەڵکو ئەو چالاکییانەش کە زیهن و مێشک کارا دەکەن، هەمان ڕۆڵ دەبینن. بۆ نموونە؛ ماسیگرتن یەکێکە لە بژاردە ناوازەکان.

## ٢- گرنگی پێ بدەن

بەتایبەتی کوڕانی هەرزەکار، ئەگەرچی خۆشیان وەها دەردەخەن کە حەز ناکەن زۆر گرنگییان پێ بدرێت و بەدەوروخولیاندا بێت، بەڵام ڕاستیی مەسەلەکە شتێکی ترە. ئەو منداڵەی کە تا ڕابردوویەکی نزیک بە گەرموگوڕی و نزیکیی سۆزداری خێزانەکەی ڕاهاتبوو، ئێستا لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە بایەخ و سۆزی خێزانەکەیەتی (بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی، ڕەنگە جارجار پێویستی بە تەنهاییش بێت)، هەنووکە ترسی ئەنجامدانی هەڵە لە هەموو کات زیاتر باڵادەستە. زۆر جار خۆشیان نازانن چییان دەوێت. لەبەر ئەوە کاتێك دەڵێت: "وازم لێ بێنن، دەمەوێت بەتەنیا بم!" ئەوا ئێوە ڕێز بۆ قسەکەی دابنێن،

> **کاتێک هەرزەکار دەڵێت: "وازم لێ بێنن، دەمەوێت بەتەنیا بم!" ئەوا ئێوە ڕێز بۆ قسەکەی دابنێن، بەڵام هەرگیز نەکەن بەتەنیا جێی بهێڵن، چونکە زیاد لە هەموو کاتێک پێویستی بە سەرچاوەیەکە دڵی بداتەوە و لێی تێبگات.**

بەڵام هەرگیز نەکەن بەتەنیا جێی بهێڵن، چونکە زیاد لە هەموو کاتێک پێویستی بە سەرچاوەیەکە دڵی بداتەوە و لێی تێبگات.

## ٣- مشتومڕی لەگەڵدا مەکەن

منداڵی هەرزەکار بیرکردنەوە و هەستەکانی خۆی زۆر لا گرنگە و شانازی پێوە دەکات، بۆیە زۆربەی کات دان نانێت بە هەڵەکانیدا، با لەسەر حەقیش نەبێت. بەپێچەوانەوە، کەللەڕەقی دەنوێنێت و سووربوون لەسەر قسەی خۆی نیشان دەدات. هەرزەکار حەزی لێ نییە هەڵەکانی بدرێتەوە بە ڕوویدا و تەریق بکرێتەوە، چونکە کردارێکی لەو جۆرە بە هەڕەشە دەیبینێت بۆ سەر کەسایەتییەکەی. پێویستە دایک و باوکان ئەوەیان بیر نەچێت، کە هەمیشە بەدۆڕاوی دێنە دەرەوە لەو دەمەقاڵێیانەی لەگەڵ ڕۆڵە هەرزەکارەکانیاندا دەیکەن. جیاوازییەکی ئەوتۆشی نییە لەسەر حەق بن یان نا. هەتا ئەو کاتەی ئەوان -هەرزەکاران- بۆچوون و بیرکردنەوەکانیان بە کەسێتی و ناسنامەی خۆیان بزانن، هەرچییان بۆ ڕاست بکەیتەوە ئەوان دەیخەنە سەر خۆیان و وا لێکی دەدەنەوە کە گوایە تۆ دەتەوێت کەسێتییان بشکێنیت. بە بەرگریکردنی لە بۆچوون و بیرکردنەوەکانی، پێی وایە بەرگری لە شکۆ و ناسنامەی خۆی دەکات. بۆیە پێویستە باوان وریا بن، دەبێت خۆیان بپارێزن لەوەی بێهودە موناقەشەکانیان درێژ بکەنەوە، یان ئەوەی خوانەخواستە هەرزەکارەکە هەست بکات شکستی خواردووە، چونکە ئەمڕۆ نا سبەی، بە جۆرێک لە جۆرەکان تۆڵەی خۆی هەر دەکاتەوە.

ئەی ئەگەر شتێکی پێویست هەبوو کە هەر دەبوو فێربکرێت، ئەوکات چی؟ لەو حاڵەتەدا دەتوانین لە کەشێکی ئارامی دوور لە دەمەقاڵێ و مشتومڕدا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو کات و شوێنەی گفتوگۆکەی تێدا دەکەین،

هەڵدەستین بە شێوەیەکی هەستیار بابەتەکەی دەخەینە بەر دەست. ئەگەر دەتانزانی قسەی سەرپێی و دەمەقاڵێ لەبەر چاوی خەڵکدا چەندە زیانبەخشە، هەرگیز توخنی نەدەکەوتن.

بۆ نموونە؛ هەرزەکار حەزی لە ئامۆژگاری نییە، حەز دەکات خۆی ڕێ نیشانی خەڵکی بدات و ئاراستەیان بکات. بۆیە پەروەرشیاران دەتوانن سوود لەم تایبەتمەندییە وەربگرن؛ هەر کات ویستیان شتێک لە منداڵەکەیاندا ببینن، ئەوا سەرەتا داوای لێ دەکەن ئەو فێریان بکات. واتە داوای لێ دەکەن سەبارەت بەو شتە ڕێنماییان بکات و پێشنیاریان بخاتە بەر دەست.

## ٤- سزای هەرزەکار مەدەن

هیچ مرۆڤێکی خاوەن ڕێز، ڕازی نییە بەوەی سزا بدرێت. ئەوانەی هەست و شکۆیان زیندووە، هەمیشە کاردانەوەی نەرێنییان هەبووە بەرامبەر سزا. جا ئەگەر ئەمە لە کەسە ساغەکاندا بەو جۆرە بێت، دەبێت لە هەرزەکاراندا چۆن بێت، کە هەر لە بنەڕەتدا هەستەکانیان تێکەڵ و پێکەڵە. تاکی سزادراو، سزادەر دەردەچێت. ئەو هەرزەکارەی ئێوە ئەمڕۆ سزای دەدەن، چاوەڕێی ئەوەی لێ بکەن ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەویش سزای ئێوە بدات، بەڵام خەمەکە ئەوەیە ڕەنگە سزاکەی ئەو ئامانی نەبێت.

> **دایک و باوکێک شک نابەم، دەمەقاڵەیان لەگەڵ منداڵە هەرزەکارەکەیان کردبێت و بەبراوەیی هاتبنە دەرەوە.**

# شپرزیی لە ڕۆڵەکانی ناو خێزاندا



## ڕۆڵی دایك و باوك چییە لەناو خێزاندا؟

بەڕێزان، لە بەشی یەکەمدا هەڵوێستەیەکمان لەسەر ڕۆڵی دایکایەتی و ئەو بار و کۆڵانە کرد کە لە سەرشانی دایکانن، لە بەشی دووەمیشدا تیشکمان خستە سەر هەندێک لەو هەڵسوکەوتانەی کە دایکان و منداڵان دەینوێنن. ئەوە بوو لەوێشەوە دایکانمان گەڕاندەوە بۆ سەردەمی منداڵیی خۆیان و ئەو یادەوەرییانەی لەگەڵ دایکیاندا هەیانە. ئەوجا ڕێمان بۆ خۆشکردن تاکو ڕۆڵەکەی ئێستایان کە دایکایەتییە، بخەنە ژێر پرسیارەوە. هەوڵمان دا وەڵامی پرسیاری ئەو دایکە دڵسۆزە بدەینەوە، کە تامەزرۆیە بزانێت: "هەڵەکەم لەکوێدایە؟"

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێش: باشە با بڵێین ئەوە دایک خۆی ناسی و ئاگاییشی سەبارەت بە ڕەفتارەکانی پەیدا کرد، ئەوجا چی؟ ئایا ئەوە گەرەنتی پەروەردەیەکی تەندروست دەکات؟ بێگومان نەخێر... ئاخر پەروەردەی منداڵ شتێک نییە دایکان بەتەنها بتوانن پێی هەڵبستن. باشە وتمان دایکەکە دەزانێت چۆن مامەڵە بکات، ئەی ئەگەر باوکەکە مشتێکیش چییە هۆشیاری نەبوو و ئەوەی دایک بنیاتی دەنا لە چەسپاندنی بەهاداری و بنەماکانی ئەخلاق و ڕەفتاری هاوسەنگ، ئەو بەچاوتروکانێک دەیڕوخاند، ئەوسا چی دەڵێیت؟

بۆیە ئەم بەشەمان تەرخان کردووە بۆ قسەکردن لەسەر ئەو پرۆسە پەروەردەییەی کە بە دایک دەست پێ دەکات و بڕیار وایە لەگەڵ باوکدا بەردەوام بێت.

## ئایا ئەندامانی خێزان ڕۆڵی خۆیان دەزانن؟

لەناو خێزاندا دوو کارەکتەر ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە پەروەردەکردنی منداڵەکاندا، یەکێکیان دایکە و ئەوی دیکەشیان باوکە. بەڵام ئەو دیمەنەی ئێمە لە زۆرێک لە خێزانەکاندا بەر چاومان دەکەوێت، تێکەڵاوبوونی ئەو دوو ڕۆڵەیە (دایکایەتی و باوکایەتی). بۆ نموونە؛ هەلومەرجەکانی ڕۆژگار دایکان ناچار دەکات کە لە هەمان کاتدا هەر دوو ڕۆڵەکە بگرێتە ئەستۆ، واتە ناچارە هەم دایکایەتی بکات هەم باوکایەتیش. هەرچی باوکی ماندوونەناسە، بەیانیان زوو لە ماڵ دەردەچێت و تا درەنگانێک لەسەر ئیش و کارە. ئیتر مەگەر لە پشووی ساڵانە، یان کۆتایی هەفتە و پشووە کورتەکاندا بتوانێت قەرەبووی باوکایەتییەکەی بکاتەوە. ئیدی منداڵیش بەناچاری بە یەک باڵەوە دەچێتە ناو کۆمەڵگەوە.

## ئایا دایك دەتوانێت بەبێ باوك، دایكایەتی بكات؟

کاتێک دەچمە بنجوبناوانی ئەو ڕەفتارە شەڕانگێز و هەڵسوکەوتە توندوتیژانەی کە لەو دایکانەدا دەبینرێت کە بە مەبەستی وەرگرتنی چارەسەر دێنە لام، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا نەبوونی باوک و فەرامۆشکردنی ڕۆڵەکەی لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا هۆکاری سەرەکییە.

نکۆڵی ناکرێت لەوەی کە لەم سەردەمەدا سەرۆکایەتیکردنی خێزان لەچاو جاراندا بە ڕێژەیەکی بەرچاو قورس بووە. کورتهێنانی ئابووری، هاوکات

لەگەڵ ئـارەزووی ژیـانێکی خوشـگوزەرانتر، بـووەتە هـۆی ئەوەی باوکـان کەمتەرخەمـی بنـوێنن لە ئەرکـی باوکایەتیـدا. ئەگەر هۆکـاری ئەو کەمتەرخەمییەش؛ دابینکردنی داهـاتوویەکی گەشـتر بێـت بـۆ منـداڵەکان، یـان دەستەبەرکردنی ژیانێکی خۆشتر، هـیچ لە مەسـەلەکە ناگۆڕێـت. کەمتەرخەمـی هەر کەمتەرخەمییە، جا لەژێر هەر ناو و بە هەر پاساوێک بێت.

گەورەتـرین پشـتیوان و هاوکـاری دایکێـک، کە نیەتـی پەروەردەکردنـی جگەرگۆشـەکانی هێنـاوە، هاوسـەرەکەی، واتە بـاوکی منـداڵەکانیەتی. بەڵام ئەگەر دایک سەرەڕای دایکایەتی، هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشـاییەش بـدات کە لە نەبـوونی بـاوکەوە سـەرچاوەی گرتـووە، لەو حـاڵەتەدا بێسـەروبەرەیی دێتە ئـاراوە. هۆکـاری ئەمەش زۆر سـادەیە؛ هـیچ دایکێـک توانـای ئەوەی پـێ نەبەخشـراوە باوکـایەتی بکـات.

> گەورەترین پشتیوان و هاوکاری دایکێک کە نییەتی پەروەردەکردنی جگەرگۆشەکانی هێناوە، هاوسەرەکەی، واتە باوکی منداڵەکانیەتی. لەبەر ئەوە بۆشایی باوک دەبێتە مایەی بێسەروبەرەیی لەناو ماڵدا.

ڕەنـگە بـۆ ئەو چەنـد ڕۆژەی کە بـاوک لە مـاڵ نیـیە بتوانێـت بەو کـارە هەسـتێت، بەڵام ئەگەر لەبـری حـاڵەتێکی کـاتی بـوو بە تەرزی ژیان، ئیدی ئەوسـا کـاری دایک ڕوو لە دژواری دەکات.

## کاتێك باوك کچەکەی ئاگادار دەکاتەوە

گریمان کاک شێرزاد کە باوکی لەنـجەیە، لەوە تـووڕە بـووە کە لەنجەی کچـی درەنـگ هـاتووەتە مـاڵەوە. بـاوکی بـۆ دوایەمەیـن جـار ئاگـاداری دەکاتەوە:

"گوێ بگرە کچم، تـۆ کـاتژمێر (٤) لە قوتابخـانە تەواو دەبیـت، ڕێـگەی نێوان مـاڵ و قوتابخـانەش تەنیـا نیـو کـاتژمێرە، تـۆ بڵـێ کاتژمێرێـك. واتە پێویسـت دەکـات کـاتژمێر (٥) تـۆ لە مـاڵەوە بیـت. بەڵام هەمـوو ڕۆژێـک کـاتژمێر (٦) بە خاوەخـاو خـۆت دەکەیـت بە ماڵـدا. ئیـتر لەمەودوا دەبێـت کاتژمێر (٥) تێپەڕ نەکات لە ماڵەوە بیت. خوام لەو خوایەی دوا بکەویت!"

بۆ ڕۆژی دواتر، لەنجە هەروەک جاران کـاتژمێر (٦) دێـتەوە. بـا پـێکەوە بزانین چی ڕوو دەدات:

بەدزەدز خـۆ دەکـات بە ژووردا، سـەرەتا دەیەوێـت دڵنیـا ببێـتەوە لەوەی باوکی لە ماڵە یان نـا، بـۆیە سـەیری پێڵاوەکـانی دەکـات. لەو سـەروبەندەدا دایکی دێـتە لای دەرگـای مەدخەلەکەوە و بە نیگەرانیـیەوە کە لە ڕووخسـاریدا دەخوێنرێتەوە، بە کچەکەی دەڵێت: "لەنجە، کچـی خـۆم بـۆ دواکەوتیـت؟" دەبێ لەنجە چۆن وەڵام بداتەوە؟

"دایە، تۆ پێم بڵێ باوکم هـاتووەتەوە؟" ئـاخر گەورەتـرین نیگەرانیـی ئەو لەو کـاتەدا ئەوەیە، بـاوکی پـێش خـۆی هـاتبێتەوە. کە لە زاری دایکـیەوە دەبیستێت هێشتا باوکی نەگەڕاوەتەوە، هەناسـەیەکی ئاسـوودەیی هەڵـدەمژێت و بێ سێ و دوو بەرەو ژوورەکەی دەڕوات.

دایکیشی بەدەم پرتەوبۆڵە دوای دەکەوێت: "ئەرێ کچێ، تـۆ بـۆ ئەوەنـدە بێگوێیت؟ دەبێت چەند جاری تر ئاگادارت بکەینەوە؟ مەگەر دوێنێ باوکـت لەسەر ئەوە لێت تووڕە نەبوو؟"

وە نەبێت ئەویش بێدەنگ دابنیشێت و بەرپەرچی قسـەکانی دایکـی نەداتەوە: "بەڵێ، وا دەزانن خەریکی کاری خراپم، وا نییە؟ جا بـۆ ئێـوە کەی متمانەتـان بە من هەبووە؟" ئەم قسانە دەکات و دەرگای ژوورەکەی لەسەر خـۆی دادەخـات و

ناهێڵێـــت دایکـــی بچێـــتە ژوورەوە. نەهــاتنەوەی باوکیشـــی ئەوەنــدەی تــر بــوێریی دەداتــێ، لەودیــو دەرگــاکەوە دەمەدەمێ لەگەڵ دایکی بکات.

ئێستا بــا هەمــان حــاڵەت، بەڵام ئەم جارە لە گۆشەنیگایەکی ترەوە تــاووتوێی بکەین:

> **ئەگەر لەناو خێزانێکدا لەبری باوک، دایک بوو بە سینبولی دەسەڵات، باوک دەست دەکێشێتەوە لە پیادەکردنی دەسەڵاتەکەی.**

ڕۆژێک پێشتر باوکەکە کــچەکەی ئاگــادار دەکــاتەوە، بەڵام بــۆ ڕۆژی دواتــر دیســانەوە درەنــگ دێــتەوە. لەگەڵ هــاتنە ژوورەوەیــدا، تەماشــا دەکــات بزانێــت پێڵاوەکەی باوکی لێیە. ئەم جارەش وتووێژێک لە نێوان دایک و کیـژدا دروسـت دەبێت:

- باوکم هاتووەتەوە؟

- دەمێکە هاتووەتەوە، پێی ناخۆش بوو کە دواکەوتویت، وا دیــار نیـیە کە حاڵی باش بێت.

لەنــجە بە هەمــان شــێوەی ســیناریۆی یەکەم، بەدەم پرتەوبــۆڵەوە ملــی ژوورەکەی خۆی دەگرێتە بەر، بەڵام با بزانین دەکەوێتە دەمەقــاڵی لەگەڵ دایکی یان داوای پشتگیری لێ دەکات.

- دایە گیان، بەڕاستی باوکم لێم تووڕەیە؟ بەڕای تۆ چی بکەم باشە؟

لە ســیناریۆی یەکەمــدا، هەردووکیــان -دایــك و کــچ- بەشــدار بــوون لە دروستکردنی کەشێکی ناجێگیر و تەنگژاویدا. کــچەکە بەوەوە ناوەســتێت لە دایکــی تــووڕە بێــت، بەڵکــو دەرگاکەشــی بەســەردا دادەخــات و قسەشــی پێدەڵێت.

کەچی لە سیناریۆی دووەمدا، کاتێک کچەکە پێڵاوەکانی باوکی دەبینێت، داوای یارمەتی لە دایکی دەکات و هانای بۆ دەبات. لەمەوە دەگەینە ئەوەی، کە باوکان تەنانەت پێڵاوەکانیشیان ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە پەروەردەی منداڵدا. لەبەر ئەوە کە دەڵێین دایک دەپرووکێت ئەگەر بەتەنیا پەروەردەی منداڵەکەی بکات، مەبەستمان ئەوەیە بەرهەمی باوکایەتیکردن لەلایەن دایکانەوە چیتر نییە جگە لە بێسەروبەرەیی و پاشاگەردانی، چونکە ئەوە باوکانن کە بە باشترین شێوە باوکایەتی دەکەن.

## لەبەر چی دایکان ناتوانن باوکایەتی بکەن؟

لای هەمووان ئاشکرایە، کە بەسروشت پیاوان لە ڕووی جەستەییەوە بەهێزترن. پیاوان هێزیان پێ دراوە، ئافرەتانیش جوانی و سۆز و میهرەبانی. پیاوان لە ڕووکەشدا ڕەق و زبرن، چەند خۆیشیان ناسک بکەنەوە دەنگیان هەر زبر و قەڵەوە، دەنگیان جۆرێک لە سام و شکۆی پێوە دیارە. لەبەرامبەردا دەنگی دایکان کە نەرم و ناسکە، زیاتر نەرمی و بەسۆزییان لێدێت. بۆیە کاتێک هەوڵ دەدەن خۆیان زاڵ دەربخەن و نمایشی بازوویان بکەن، دەبینی دەوروبەر بەئاسانی ناچنە ژێر ڕکێفیەوە. منداڵیش ئەمە دەزانێت، بۆیە بەرامبەری دەوەستێتەوە و بەرهەڵستی بڕیارەکانی دەکات.

با پێکەوە سەرنجی ئەم نموونەیە بدەین: بە دەنگی بەرزی فەرماندەیەکی سەربازی، سەدەها سەرباز ڕیز دەبن و دەست دەکەن بە مەشقکردن، بەڵام ئەگەر دەنگی فەرماندەکە دەنگێکی پڕ و بەهەژموون نەبێت، واتە ناسک و لەسەرخۆ بێت، دەبینی هەمان کاریگەری نابێت. (مەبەستمان لەم نموونەیە، هەرگیز جیاکاری نییە لەنێوان ژن و پیاودا، بەڵکو بەپێچەوانەوە، مەبەستمان

ئەوەیە ئەگەر هەریەکەیـان بەگـوێرەی سروشـتی خۆیـان بجـوولێنەوە و هاوکاریی یەکتر بکەن، ژیانی هەردووکیان خۆشتر و ئاسانتر دەبێت).

دەمەوێت نموونەیەکی تـر بهێنمەوە لەسەر گرنگیی ڕۆڵـی باوک لە پەروەردەی منداڵدا: بیرم دێت لە یەکێک لە سیمینارەکاندا خاتوونێکی بەڕێز دەستی هەڵبڕی و بەسەرهاتێکی خۆی گێڕایەوە:

" مامۆستا ڕاست دەفەرمویت! ئەو ڕۆژە دەمویست مناڵەکان بخەوێنم، گیرم خواردبوو بەدەست هەر سێ منداڵەکەمەوە، نەدەخەوتن. تا قۆڵی یەکێکیانم دەگرت و دەمبردە سەر جێگەکەی، ئەوی تریان ڕایدەکرد و دەچوو بۆ لای یاریەکانی. ئیتر منیش گەیشتە تینم و هاوارم لە باوکیان کرد، ئەرێ تۆ چ باوکێکی، دە وەرە شتێکیان پێ بڵێ!.

خودا هەڵناگرێت یەکسەر کۆنترۆڵی تەلەڤزیۆنەکەی دانا و هات. هەر ئەوەندەی وتی: "ئادەی کەستان لەبەرچاوم نەمێنێت، خێرا بچنە سەر جێگەی خۆتان!" هەرسێکیان سەریان کز کرد و چوونە سەر جێگەکانیان. منیش لەو نێوەندەدا بەسەرسوڕماوی مامەوە. کاتژمێرێک بوو بەساقە و بەقوربانیان دەبووم بەقسەیان نەدەکردم، کەچی بە قسەیەکی ئەو ئاقڵ بوون. بەڕاستی هاوڕاتم مامۆستا، بەبێ باوک، دایکایەتی زۆر زەحمەتە".

بەدڵنیاییەوە تێبینیی خۆمان هەیە لەسەر شێوازی قسە و مامەڵەی باوکەکە، بەڵام وا بزانم لە ڕوانگەی گەیاندنی پەیامەکەوە نموونەیەکی گونجاو بوو.

بەڵێ، دووپاتی دەکەینەوە کە پەروەردەی منداڵ پرۆسەیەکی دوولایەنەیە، پێویستی بە بەشداریی ڕاستەوخۆی هەردووکیانە -دایك و باوك-. ژاوەژاو، بێسەروبەرەیی، هاتوهاواری دایک و بێبەرنامەیی لەو ماڵە دانابڕێت، کە هەموو شتێک کەوتووەتە سەرشانی دایکەکەی، چونکە دەبێت دایک زۆر لە خۆی بکات بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە لە نەبوونی هەژموون و شکۆی باوکەوە

سەری هەڵداوە. ئاشکرایە کە شتێکی لەو جۆرە چ بۆ دایک، چ بۆ منـداڵەکان، تـا بڵێـی شـتێکی مانـدووکەرە. ئەم بـابەتە ڕوویەکـی تریشـی هەیە، ئەویـش ئەوەیە کاتێک دایک هەڵدەستێت بە گێڕانی ڕۆڵی هەژمـوون و دەسـەڵات، کە خـۆی لە بنەڕەتدا کاری بـاوکە، لەو حـاڵەدا بـاوکیش دەسـت دەکێشـێتەوە لەوەی پیـادەی دەســەڵاتی باوکــایەتی بکــات. بەداخەوە، ئەمە گــرفتێکە کە لە زۆرێــک لە خێزانەکاندا چاومان پێی دەکەوێت. دایکەکە دەسـت دەکـات بەباوکـایەتیکردن، یاسا و ڕێسا دادەنێت و بەڕەقی لەگەڵیان دەجـوولێتەوە. زیـانی ئەمە لە چیـدایە؟ زیـانەکەی ئەوەیە ئیـتر منـداڵەکان ئەو سـۆز و ئەوینەیـان دەسـت ناکەوێـت کە دەبــوو لە دایکیــانەوە وەری بگــرن. لەبەرامــبەردا بــاوکیش هەڵدەســتێت بەپڕکردنەوەی بۆشایی دایـک و هەوڵ دەدات ببێـت بە بـاوکێکی دایکئاسـا. لەو نێوەندەشدا منداڵەکان هەم لە سۆزی دایکایەتی بێـبەش دەبـن، هەم لە هەژمـوون و سـونبولی باوکـایەتیش. بـۆیە دەبینـی دەکەونە بەربەرەکـانێی ئەو حـاڵەتەی کە نامۆیە بە سروشتی ناخی دایکیان.

## باوك لەناو خێزاندا سونبولی دەسەڵاتە

مەبەسـتمان لە دەسـەڵات، دانـانی ڕێسـا و زامنکردنـی جێبەجێکردنیەتـی. بەکارهێنانی هەڵەی دەسەڵات لەناو خێزاندا، سەر دەکێشێت بـۆ یەکێـک لەم دوو حـاڵەتە: گـوێپێنەدان یـاخود خۆسـەپێنی. گرتنەدەسـتی دەسـەڵات و بـوون بە خـاوەنی بڕیار بە خۆسەپاندن نابێت، بەڵکـو بەوە دەبێـت ئەنـدامانی خێـزان خۆیـان بە شـێوەیەکی ئارەزوومەنـدانە ئەو کەسـە دیـاری بـکەن کە سەرچاوەی بڕیاردانە.

> **بوون بە خاوەن بڕیار و دەسەڵات، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە گرژومۆن و بەزەبر بێت.**

بوون بە خاوەن بڕیار و دەسەڵات، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە گرژومۆن و بەزەبر بێت. خاوەن دەسەڵاتی ڕاستەقینە، ئەو کەسەیە کە خۆشمامەڵەیی و ڕووخۆشییەکەی تێکەڵ ناکات بەو لایەنەی کە یاسا دادەنێت و بڕیاری کۆتایی دەدات. بۆ نموونە؛ مامۆستا خاوەنی دەسەڵاتە لەناو پۆلەکەیدا. ئەو پۆلەی مامۆستای تێدا نییە، دەڵێی شاری بێ حاکمە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە خۆی تووڕە بکات و دەموچاوی بدات بەیەکدا کاتێك قوتابییەکانی نمرەی بەرز ناهێنن. تەواو پێچەوانە، ئەگەر پێیان بڵێت: "هیوادارم بۆ جاری داهاتوو نمرەی بەرز بەدەست بهێنن." لەم بارەدا نە دەسەڵات و پایەکەی دەخاتە ژێر پرسیارەوە، نە ڕووخۆشی و خۆشەویستییەکەشی لەدەست دەدات.

> ئەگەر باوک پیادەی دەسەڵاتی نەکات، گیروگرفتەکان تەنگ بە خێزان هەڵدەچنن.

هاوشێوەی ئەو نموونەیەی سەرەوە، دروست نییە باوک لەناو ماڵدا بەردەوام گرمەی بێت و ناوچەوانی گرژ کردبێت و کەس نەوێرێت لێی نزیک ببێتەوە، چونکە ئەوە پێی ناوترێت دەسەڵاتداری، ئەوە دیکتاتۆرییە. جەمسەرێکی ئەم ناوەندەڕێیە -کە بوون بە سونبولی دەسەڵاتە- بریتییە لە خۆسەپێنی و زۆرداری. جەمسەرەکەی تریشی ئیهمالی و پشتگوێخستنە.

هەندێک جار ڕێی تێدەچێت لەناو خێزانێکدا باوکەکە لە ئاست بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانیدا نییە، ئاگایی نییە سەبارەت بەوەی کە سونبولی دەسەڵات و بڕیارە لەناو خێزانەکەیدا. سەرەنجامی ئەمەش هاتنەکایەی مۆدێلێکی خێزانیی گرفتاوییە (١. مۆدێلی خێزانیی خۆسەپێنەر. ٢. مۆدێلی خێزانیی فەرامۆشکار). مانەوەی دەسەڵات بەهەڵواسراوی دەبێتە هۆی ئەوەی

ئەندامانی تری خێزان، دایک یان هەر ئەندامێکی تر، وەک سەرچاوەیەکی هێز بە شێوەیەکی تاکلایەنە لە بەرژەوەندیی خۆیان بەکاری بهێنن.

لەم ڕووەوە زۆر گرنگە باوک هەستێت بە بەجێگەیاندنی ئەرکی گرتنەدەستی دەسەڵات و بڕیار، بەڵام بیرمان نەچێت ئەوە دایکە کە ئەو (دەسەڵاتە سروشتییە) دەبەخشێت بە باوک. هەتا ئەو کاتەی دایک دان نەنێت بە پێگەی باوکدا، باوک چەندە هەوڵ بدات ناتوانێت بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەستێت لەناو ماڵ و منداڵەکەیدا. باوک ئەو کاتە باوکە کە هاوسەرەکەی -دایکی منداڵەکان- ئەو پێگەیەی پێ ڕەوا دەبینێت و بەو چاوەوە بۆی دەڕوانێت. ئەگینا ناتوانێت وەک پێویست باوکایەتی بکات، با ئەو باوکە خاوەن هێز و سەروەت و سامان و ناوبانگیش بێت.

## دایك لەناو خێزاندا ڕۆڵی هاوسەنگی دەبینێت

دایک هۆکاری پاراستنی هاوسەنگیی ناو خێزانە. هەموو ئەو شتانەشی کە بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پێویستیەتی، لە ناخیدا دانراوە. لە خێزانێکی تەندروستدا، هەستی سۆز و میهرەبانی ناو ناخی دایک توانای نۆژەنکردنەوەی سەرجەم ئەو ناهەموارییانەی هەیە کە ڕوو لە خێزان دەکات. بۆیە کە لەم ڕووەوە دەڕوانین، دەبینین کە بە تەواوی مانا دایکان سەرچاوەی سۆز و میهرەبانین بۆ خێزانەکانیان.

بەڵام بەداخەوە، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە چاوی ناکاراییەوە تەماشای ئەو دایکە دەکرێت، کە بووەتە کانگای سۆز و بەزەیی بۆ خێزانەکەی. ئەگەر دایکێک بە سۆز و ئەوینی دایکانەوە لەگەڵ جگەرگۆشەکەیدا بجووڵێتەوە، دەورویەرەکەی ئامۆژگاری دەکەن: "ئەوەندەش نەرمونیان مەبە لەگەڵ منداڵەکانتدا، کە گەورە بوون بەگوێت ناکەن." لە کاتێکدا ئێمە دەزانین

پابەندبوونی منداڵان بە یاسا و ڕێساکانی ناو خێزانەوە، پەیوەنـدیی بە هەژمـوونی باوکەوە هەیە. ئەوجا دایک دێـت و کـاریگەریی هەژمـوون و دەسـەڵاتی بـاوک هاوسەنگ دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر ئەویش هاوشـێوەی بـاوک بەرگـی دەسـەڵاتی پۆشی، ئیدی ئەوسا کانیاوی سۆز و میهرەبـانی لەنـاو خێزانـدا وشـک دەکـات. لەوەهـا بارێکـدا منـداڵی بێچـارە چـی بکـات ئەگەر پێویسـتی بە سـۆز و خۆشەویستی هەبوو؟ ئەگەر منداڵ دەستی نەگەیشت بە دایک و لێـیەوە تینوێتیی ناخی نەشـکاند، دەچێـت لەدەرەوە و بە ئەم و ئەو ئەو بۆشـاییە ترسـناکەی نـاخی پـڕ دەکـاتەوە، چـــــونکە خۆشەویســــتی پێداویستییەکی لەبننەهاتووە.

> **پابەندبوونی منداڵان بە یاسا و ڕێساکانی ناو خێزانەوە، پەیوەندیی بە هەژمـوونی باوکەوە هەیە. ئەوجا دایک دێت و کاریگەریی ئەو هەژموون و دەسەڵاتە هاوسەنگ دەکاتەوە.**

لەناو خێزانێکـی تەندروسـتدا، دایـک و بـاوک هاوکـاریی یەکـتر دەکەن و شانبەشانی یەک منداڵەکانیان گۆش دەکەن. نیشـانەی لاوازی نیـیە ئەگەر هاوسەران کەموکورتیی یەکتری پڕ بکەنەوە، بەڵکو گەورەترین ئاماژەیە بـۆ ئەوەی کە بە پرۆسـەیەکی تەندروسـتدا تێـدەپەڕن. بـا بڵێـین یەکێـک لە منداڵەکان پەیڕەوی ڕێساکان ناکات و کەشـی مـاڵ تێـک دەدات. لەم بـارەدا بـاوک دێـت و بە دەسـەڵاتەکەی سـەروەری یاسـا -کە کـۆدەنگیی تەواوی ئەندامانی خێزانی لەسەرە- دەچەسپێنێت. ڕەنگە لەو کاتەدا منداڵەکە پێویستی بە دڵدانەوە بێت. جا چییە؟ باوەشی پڕ سۆزی دایک ئامـادەیە، کەی ویسـتی دەتوانێت پەنای بۆ بەرێت و ئارامیی دەسـت بکەوێـت. دایـک دەتوانێـت بە زمانە هەنگوینییەکەی خۆی، بایەخی گوێڕایەڵیی ڕێساکانی بۆ ڕوون بکاتەوە.

بەدەم قسەکانیشـیەوە، دەسـت بهێنێـت بە سـەر و قژیـدا. ئیتر بەو جـۆرە لە لایەکەوە لەگەڵ قورسیی بەجێهێنانی ڕێساکاندا ڕایەت، لە لایەکـی تریشـەوە فێـری ئەوە دەبێـت کە بە بـوونی خۆشەویسـتی دەتوانێـت بەسـەر هەمـوو ناڕەحەتییەکاندا زاڵ ببێت.

ئەوەی بەلامەوە سەیرە ئەوەیە، لە زۆرێک لە سیمینارەکانمدا دەبینم دایکان بە شێوەیەکی تـر بـۆ مەسـەلەکە دەڕوانـن. بەشـێکی زۆریـان پێیـان وایە، کە پێویستە دایک و باوک بە هەمان جۆر مامەڵە بکەن. ئەگەر لەبەر هەر هۆیەک باوک سزای منداڵەکەی دا، پێویستە دایکیش بەنەرمی لەگەڵیدا نەجووڵێتەوە. بەڵام من دەپرسم: ئەو منداڵەی لەدەست یاسا و ڕێساکانی باوکی ڕادەکـات، ئەگەر پەنا نەباتە بەر باوەشی دایکی، ئەدی پێم ناڵێن پەنا بەرێتە بەر باوەشـی کـێ؟ ئایـا ئەو دایـک و باوکـانە خەمـی ئەوەیـان نیـیە منـداڵەکەیان بەدوای باوەشێکی تردا بگەڕێت لەدەرەوەی خێزان؟

بەدەر لەوە، ئەو منـداڵانەی ڕووبەڕووی سـزا دەبـنەوە لەلایەن بـاوک و دایکیشیانەوە، خۆیان دەدەنە دەست هەستە نەرێنییەکانیان ئاڕاستەیان بکات؛ تووشی هەڵچوون دەبن و ڕق و تووڕەیی لە ناخیاندا هەڵدەگرن. جگە لەوەی کە لە دەرگای کەس و شتی تر دەدەن و سـەرگەردان دەبـن، ئەوەنـدە بەدوای دڵدانەوەدا دەگەڕێن. کە منداڵ گەیشتە ئەم قۆناغە، هیچ شتێک سوودی نییە؛ نە ئازاری ویژدانی دایک و باوک، نە پەشیمانی و حەسرەتیان.

کە وا بێت جێـی خـۆیەتی ئەم بۆچـوونە چەوتە ڕاسـت بکەیـنەوە. پێویسـتە ئامێزی پڕ سـۆز و خۆشەویسـتیی دایـک هەمیشـە کـراوە بێـت. کاتێـك منـداڵ لەدەست باوکی هەڵهات، پێویستە پەناگەیەک هەبێت هانای بۆ بەرێت. بەڵام ئەو ئامێزە ئامێزێک نییە بۆ لەکەدارکردنی شکۆ و دەسەڵاتی بـاوک، بەڵکـو ئـامێزێکە ئەو دەسەڵاتە و پێداگرییە لەگەڵ خۆشەویستی و میهرەبانیدا دەشێلێت.

## پێگەی دایك و باوك لە دنیای منداڵدا

وەک لەسـەرەوە ئاماژەمـان پـێ دا، منـداڵ هەم پێویسـتی بە دایـکە، هەم پێویستیشی بە باوکە. لەم ڕوانگەیەوە دەتوانین بڵێین، خێزانی تەندروست ئەو خێزانەیە کە سەرکەوتوو بووە لە ڕاگرتنـی هاوسـەنگی لەنێـوان دەسـەڵات و سۆزدا. چونکە ئەو خۆراکە سـۆزییەی منـداڵ لە بـاوکیەوە وەری دەگرێت، جیاوازە لەو خۆراکەی کە لە دایکیەوە وەری دەگرێت.

بەداخەوە، هەندێک لە باوکانی ئەمڕۆ پاساوێکیان بۆ خۆیان داتاشیوە و بە هۆیەوە ڕادەکەن لە ئەرکی باوکایەتی: "ڕاستە کاتێکی کەمـم هەیە بـۆ بینینی منداڵەکانم، بەڵام کە پێکەوە دەبین دڵێی هاوڕێین، ئەوەندە نێوانمان خۆشە." زۆرێکی تریش سکاڵا دەکەن لەدەسـت ڕاکەڕاکـی بەدەسـتهێنانی بژێـوی و ئیشوکار: "مەپرسە چەندە سەرقاڵم، شەوان ئەوەندە درەنگ دێمەوە، منداڵەکان خەوتوون. بەیانیانیش پێش ئەوەی ئەوان هەستن، من لە ماڵ دەرچووم".

نـاتوانم بەتەواوەتـی بڵـێم ئیشـوکار و بژێـویی ژیـان، باوکـانی لە مـاڵ و منـداڵەکانیان دوور خستووەتەوە. ئـاخر باوکـان لە کۆنیشـدا -هەر وەک ئێستا- بەدوای بژێـوییەوە مانـدوو بـوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا کـاتی ئەوەیـان هەبوو چیرۆک بۆ منداڵەکانیان بگێڕنەوە و باسی بەسەرهاتەکانی خۆیانیان بۆ بکەن.

بوونی بـاوک، ئـارامی دەبەخشـێت بە منـداڵ. یەکێـک لە خۆشـترین و پڕ دڵنیاییترین کاتەکانی منداڵ، ئەو کاتانەیە کە لەگەڵ باوکیدا بەسەری دەبات. بڕوا ناکەم باوکان بتوانن بڵێن: "با زۆر سەرقاڵیش بـم، بەڵام دیسـانەوە ئەوەی لەدەسـتم بێـت دەیـکەم بـۆ ئەوەی منـداڵەکەم فەرامـۆش نەکەم." بـۆچی؟ پزیشـکێک بهێننە بەر چاوتـان، کە هەڵدەسـتێت بە بڕینـی ئەو بـۆرییەی کە ئۆکسجین دابین دەکات بۆ یەکێـک لە نەخۆشـەکانی. ئەوجـا پاسـاو بۆ ئەم کارەی دەهێنێتەوە و پێی دەڵێت: "داوای لێبـوردن دەکەم، ئەوەنـدە کـاتم نییە

خەریکی تۆ بم، وەک دەبینیت زۆر سەرقاڵم. بەڵام دڵ لە دڵ مەدە، جارجار سەردانت دەکەم و ئۆکسجینەکەت بۆ دەبەستمەوە و بۆ خۆمان دەمەتەقێ دەکەین." بە ڕای ئێوە، وەڵامی نەخۆشەکە دەبێت چی بێت؟ نەخۆشەکە پێویستی بەوەیە هەموو ساتێک ئۆکسجین هەڵبمژێت، نەوەک بەگوێرەی کاتی پزیشکەکە خۆی ڕێک بخات.

دۆخی منداڵیش جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ ئەمەدا. ئەو کاتانەی باوک لەگەڵ منداڵەکەیدایە، هاوشێوەی نەخۆشەکە کە ئۆکسجین هەڵدەمژێت، ئەگەر هیچ شتێکیش نەکات، هەر ئاسوودەیی و دڵنیایی پەخش دەکات. چونکە باوکان بە شێوەیەك بەدی هێنراون، کە هەستی دڵنیایی و ئارامی بە منداڵەکانیان ببەخشن.

بۆ نموونە؛ بە شێوەیەکی گشتی هەمان شڵەژانی ڕەفتاری لەو منداڵە کوڕانەدا بەدی دەکرێت، کە بەبێ باوک گەورەبوون. گرفتی سەرەکی ئەو کوڕانەی کە بێبەش بوون لە خۆشەویستی و بایەخی باوک ئەوەیە، ناتوانن لەسەر ڕەوتێکی هاوسەنگ ژیان بگوزەرێنن، هەروەها بەزەحمەت ئەو بڕیارانە دەخەنە بواری کردەییەوە کە لە ژیانیاندا دەیدەن. کەواتە دەتوانین بڵێین گەورەترین دەرهاویشتەی بێ باوکی لە کوڕاندا بریتییە لە بڕیاربۆنەدران، بێبەرنامەیی و شپرزەیی، لەگەڵ بێئیرادەیی.

کوڕان لە باوکیانەوە فێر دەبن پیاو دەبێت چۆن بێت. جا ئەگەر لەناو خێزاندا باوک یان کارەکتەرێک نەبوو کە ڕۆڵی باوکایەتی ببینێت، کوڕی ناو ئەو خێزانە فێری باوکایەتی نابێت و هەلی ئەوەی بۆ نارەخسێت بزانێت کاروباری ناو ماڵ چۆن بەڕێوە دەبرێت و بە چ شێوازێک مامەڵە لەگەڵ خانمی ماڵدا دەکرێت. چی لەوە دژوارترە، منداڵێک لە قۆناغەکانی

گەشـەیدا ئەو کەسـەی لەپاڵـدا نەبێـت کە پێویسـتە بیکـات بە سەرمەشـق و مۆدێل بۆ خۆی!.

گرنگیی بوونی باوک تەنیا لە کوڕاندا کـورت نـابێتەوە، بەڵکـو بـۆ کچـانیش زۆر گـرنگە. کچـان لە باوکیـانەوە هەسـتی دڵنیـایی و ئاسـاییش وەردەگـرن، پێداویستیی (خۆپەنادانە پاڵ کەسێکی بەهێز) لە ناخیانـدا پـڕ دەبێـتەوە. پاڵپشـت بە ئەزمـوونی کەسـیی خـۆم، دەتـوانم بڵـێم ئەو کچـانەی کە وەک پێویسـت هەستیان بە بوونی باوکیـان نەکـردووە لە ژیانیانـدا، بەردەوام بەدوای پەنـاگەیەکی ئارامدا دەگەڕێن کە دالدەیان بدات، لەژێر پەنا و سێبەری ئەو کەسـانەدا هەسـت بە ئاسـوودەیی دەکەن کە لە خۆیـان بەهێزتـرن. تەنـانەت زۆر جـار ئەو کەسـەی هاوسەرگیریی لەگەڵ دەکەن، حەز دەکەن بە تەمەن لە خۆیان گەورەتر بێت.

ئەو هەستانەی کچێک لە باوکیەوە وەری دەگرێت، تا بڵێی تایبەتە. بـاوک وەک گەورەتـرین پاڵپشـت و پـڕکەرەوەی لایەنە لاوازەکانیـان دەبیـنن. بـۆ نموونە؛ ئەو وزە ئەرێنییەی کە لەکـاتی داهێنـانی قـژی بـاوکی، یـان چـوونە باوەشی، یان هەر شتێکی ترەوە وەری دەگرێت، لە هیچ کەسـێک و شـتێکی ترەوە وەری ناگرێت.

لەبەر ئەوە گەورەتـرین شـڵەژانی ڕەفتـاریی ئەو کچـانەی کە بـێ بـاوک گەورە بـوون، بـریتیە لە پڕنەبـوونەوەی ئەو پێداویسـتییەی کە بـۆ پەنـادان و پـارێزران هەیـانە، هاوکـات لەگەڵ هەسـتکردن بە نائاسـوودەیی دەروون و هەڵچوون. قەرەبووکردنەوەی ئەو پێداویستییانەش لە قۆناغەکانی دواتردا، تـا بڵێی کارێکی سەخت و ئەستەمە.

ئەو باوکـانەی لەتـاو دەوام و ئیشـوکار بواریـان نییە کـات بـۆ منـداڵەکانیان تەرخان بکەن، دەبێت ئەوە بزانن کە شـتگەلێکیان فەرامـۆش کـردووە، کە دواتـر نەک بە پارە بەڵکو بە هیچ شتێکی ئەم دنیایە بەدەست نایەن و ناکڕدرێن.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بە خاڵێکی ورد بکەین: جاری وایە باوکەکە لەماڵیشە، بەڵام وەک پێویست گرنگی نادات بە منداڵەکانی و حساب بۆ هاوسەرەکەی ناکات و شکۆ و کەسێتیی ئەندامانی خێزانەکەی بریندار دەکات. ئەو منداڵانەی لەبەر دەستی باوکێکی لەو جۆرەدا پێدەگەن، ئەوانیش وەک باوکیان شکۆشکێن و توندوتیژ دەردەچن. لە هەمووشی ناخۆشتر ئەوەیە، یەکەم کەس دایک و باوکەکە خۆیان دەبنە قوربانیی بەرهەمەکەی خۆیان.

## نهێنیی باوکایەتی نموونەیی: کۆبوونەوەی خێزانی

تاکو ئێرە هەوڵمان دا تیشک بخەینە سەر گرنگی و بایەخی ڕۆڵی باوکان لە ڕەخساندنی زەمینەی لەبار بۆ دایکان، تاکو بە جوانترین شێوە هەستن بە ئەرکی سەرشانیان. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی ترەوە کۆمەڵە شێواز و ڕێوشوێنێک هەیە، کە پێویستە باوکان بیگرنە بەر تاکو بتوانن بە ئەرکی باوکایەتیی ئەستۆیان هەڵبستن. بۆ نموونە؛ گرنگترین هۆکار بۆ دروستبوونی خێزانی تەندروست، بریتییە لەو کۆبوونەوە خێزانییانەی کە هەفتانە ئەنجام دەدرێت. بەرجەستەنەبوونی ئەم تایبەتمەندییەش، لەمپەرێکی گەورەیە لەبەردەم گەشەکردنی خێزان و ئەندامەکانی.

> گەورەترین شڵەژانی ڕەفتاری لەو کچانەدا کە بێ باوک گەورە بوون، بریتییە لە پڕنەبوونەوەی ئەو پێداویستییەی کە بۆ پەنادان و پارێزران هەیانە، هاوکات لەگەڵ هەستکردن بە نائاسوودەیی دەروون و هەڵچوون.

کاتێک لە سیمینارەکانمدا

باس لە گرنگیی کۆبوونەوەی خێزانی دەکەم، هەڵوێست و کـاردانەوەی دایـک و باوکان لە دوو شێوەدا خۆی دەبینێتەوە: یان ئەوەیە دەڵێن: "ئێمە هەمـوو ڕۆژێـک کۆبــوونەوە دەکەیــن." یــان "کاتمــان هەبێــت دەیکەیــن." بەڵام ئەوەی ئـێمە مەبەسـتمانە، تەواو جیـاوازە لەوەی کە ئەوان باسـی دەکەن. قسـەی سـەرپێیی و دەمەتەقێی بەردەم شاشە، هەرگیز پێی ناوترێـت کۆبـوونەوەی خێزانـی، چـونکە ئەوەی ئێمە باسی دەکەین تاقمێک ڕێسـا و خەسـڵەتی تـایبەتی خـۆی هەیە، کە گرنگترینیان ئەمانەی لای خوارەوەن:

## ١- کات و ڕۆژەکەی جێگیرە

تێڕوانینی جۆری "کەی کاتمان هەبوو دەیکەیـن"، بەڵـگەیە لەسـەر ئەوەی کە دانیشتووانی ئەو ماڵە کۆبوونەوەی خێزانی ئەنجام نـادەن، چـونکە کۆبـوونەوەی خێزانــی کــات و ڕۆژی دیــاریکراوی هەیە و هەمــوو ئەنــدامانی خێــزانیش زانیارییان هەیە لەبارەیەوە. بۆ نموونە؛ سەرۆکی خێزان دەتوانێـت بڕیـارێکی لەم جۆرە بدات: "هەمـوو هەفـتەیەک ڕۆژی پێنجشـەممە، کـاتژمێر (٨ -٩)ی شەو کۆبوونەوەی خێزانیمان هەیە".

ئەم کــات و ڕۆژەش نابێــت بگۆڕدرێــت یــان دوا بخرێــت، مەگەر ڕەزامەندیی هەموو ئەندامانی خێزان وەربگیرێت ئینجا. کـاتی کۆبـوونەوەکە کاتێکی تایبەتە، ڕۆژەکەشـی تـایبەترین ڕۆژە. نابێـت لەو کـاتەدا میوانـداریی کەس بکرێت، یان هیچ سـەردانێک دابنرێـت. پێویسـتە هەمـوو چالاکییەکانی خێـزان بەگـوێرەی ئەو مەوعیـدە ڕێـک بخرێـت. ئەرکـی سەرشـانی سـەرۆکی خێزانە، ڕێوشوێنی پێشوەخت بگرێتە بەر بەرامبەر هەر هۆکـارێکی دەرەکـی، کە ئەگەری هەیە تەگەرە بخاتە بەردەم کۆبوونەوەکەیان.

## ٢- داخوازی جۆرێك له جددییه‌ته

مـادەم ئـێمه دەڵێـین گـرنگترین سـەرچاوەی بڕیـاردان له خێزانـدا ئەو کۆبوونەوانەیە کە ئەنجامی دەدەن، کە وا بێت پێویستە جۆرێک لە جـددییەت و پابەندبوونی تێدا بێت. ڕەفتارگەلێکی هاوشێوەی بێڕێزی نواندن، خۆنواندن و حساب بۆ نەکردن، کۆبوونەوەی خێزانی لە ناوەڕۆکەکەی بەتاڵ دەکاتەوە و دەیکات بە پرۆسەیەک بۆ خۆسەپاندن و نمایشی هێـز و بـازوو. لە نێوەنـدی ئەم چـالاکییەدا، هەمـوو ئەنـدامانی خێـزان گوێیـان لـێ دەگیرێـت و بۆچوونەکانیان بەهەند وەردەگیرێت و گفتوگۆی دوور لە تونـدوتیژی درێـژە دەکێشێت، تـاکو دەگەنە بڕیـارێکی هـاوبەش. بـاوکیش بەرپرسـی یەکەمـی پاراستنی ئارامی و هاوسەنگیی کۆبوونەوەکەیە.

**"چێژ لە باوکایەتی دەبینم."**

خێزانێک سێ منداڵیان هەبوو، گەورەکەیان کە هەرزەکارێکی (١٥) سـاڵ بوو، ڕەفتاری شەڕانگێزانەی دەنواند و کەشـی ناومـاڵی تێـک دابـوو بەسـەر یەکدا. کە کەوتمە گفتوگۆ لەگەڵیـان، بـۆم دەرکەوت کە هـیچ بیرۆکەیەکیـان نییە سەبارەت بە کۆبوونەوەی خێزانی، لە ڕاستیدا کێشەیەکی واشیان نەبـوو کە گیـر بخـۆن بەدەسـتیەوە، هاوکـات زۆر گرنگیشـیان دەدا بە دەربڕینـی خۆشەویستی لەناو خۆیانـدا. بەڵام دوای دەستنیشـانکردنی حـاڵەتەکە، بـۆم دەرکەوت کە ئەنجامنەدانی دانیشتنی خێزانی بووەتە هـۆی ئەوەی ئەنـدامانی خێـزان لەیەکـتر دابـبـڕێن و بەو شـێوەیە مامەڵەیـان لەگەڵ نەکرێـت کە تەمەنەکەیـان داخـوازیەتی. یەکەم دەرهاویشـتەی ئەم دۆخە ناسـازەش لە هەڵسوکەوتی منداڵە هەرزەکارەکەیاندا ڕەنگی دابـووەوە، چـونکە هێشتا بەو چاوەوە بۆیان نەدەڕوانی کە تەمەنەکەی شایستەی بوو.

دوای ئاڵوگۆڕی بیروڕا، گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە لەمەودوا هەموو هەفتەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا کۆبوونەوەی خێزانی ئەنجام بدەن. لەپاش یەکەم کۆبوونەوەیان، دایکیان بەم شێوەیە باسی دانیشتنەکەیانی بۆ گێڕامەوە: "ڕۆژی پێنجشەممەی ڕابردوو، کاتژمێر (٨)ی سەرلەئێوارە، دوای ئەوەی ژەمێکی بەلەزەتمان خوارد، هەموومان لەدەوری مێزێک دانیشتین و دەستمان کرد بە کۆبوونەوە. هەر وەک ئەوەی پێشتر قسەمان لەسەر کردبوو، کاغەز و قەڵەمیشمان ئامادە کرد تاکو بڕیار و ڕاسپاردەکان بنووسین. هاوسەرم پێی وا بوو کە ئەوە گەورەکردنی مەسەلەکەیە و پێویست بەوە ناکات، بیرم دێت وتی: 'ئەوە چییە خۆ نەتەوەیەکگرتووەکان کۆ نەبووەتەوە!' بەڵام دوا جار بەنابەدڵییش بێت، ڕازی بوو. لە سەرەتاوە هەستم دەکرد باوکیان نائاسوودەیە، وا دەردەکەوت کە گومانی ئەوە بەرێت دەمانەوێت دەسەڵاتەکانی لێ زەوت بکەین، بۆیە خۆشحاڵ دەرنەدەکەوت بەوەی کە هەموومان قسەمان هەبێت و ڕای خۆمان دەربڕین. یەکەم جار کچە هەشت ساڵانەکەم دەستی کرد بە قسەکردن، ئەوە بوو وتی: 'بابە گیان، شەوان تا درەنگانێک سەیری تەلەڤزیۆن دەکەیت، منیش لەتاو دەنگەکەی خەوم لێناکەوێت.' بە بیستنی ئەم قسەیە باوکیان هەڵچوو: 'لە تەمەنی تۆدا بەو جۆرە قسەمان لەگەڵ دایک و باوکمان نەدەکرد، تۆ تەماشا، چەندە زماندرێژە! ئەمە چ کۆبوونەوەیەکە!' لەو کاتەدا کە من خەریک بووم باوکیانم هێور دەکردەوە، لەپڕ کوڕە هەرزەکارەکەم دەستی کرد بە قسە: 'وەڵڵا منیش لەتاو دەنگی تەلەڤزیۆن خەوم لێناکەوێت. خوشکەکەم ڕاست دەکات.' ئەمە ئەوەندەی تر فووی کرد بە ئاگرەکەدا: 'ئێمە هاتووین کۆبوونەوەی خێزانی بکەین، نەک گوێ بۆ قسەی پڕوپوچی جەنابتان بگرم. ئەوا من ڕۆیشتم، ئێوە خۆتان چۆنتان پێ خۆشە، وەها بکەن.' ئەوەی وت و مێزەکەی جێ

هێشت. بە ڕۆیشتنی ئەو، ئێمەش کەسمان تاقەتی کۆبوونەوەکەمان نەما. سەرتان نەئێشێنم، یەکەم هەفتەمان بەو شێوەیە تێپەڕی."

ئەو ڕاستییەی کە لە هەڵوێستی ئەم باوکەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەوەیە، هێشتا ئەوەی پێ قبوڵ ناکرێت کە منداڵەکانی کەسێتی و شێوازی ژیانی سەربەخۆی خۆیان هەیە، چونکە بەوە ڕاهاتووە کەس قسە لە قسەیدا نەکات. کە هەستیشی بە نارەزایی منداڵەکانی کرد، خۆی پێنەگیرا و هەڵهاتنی بە باشترین چارە بینی، بەڵام خۆشبەختانە دوای چەند دانیشتنێک باوکەکە ئەم شتانەی بۆ گێڕامەوە:

"لێت ناشارمەوە کە لە سەرەتادا زۆر قەڵس بووم بە قسەی منداڵەکانم. ئاخر من بە دەستی خۆم گەورەم کردبوون، کەچی ئەوان هەوڵیان دەدا شتم بۆ ڕاست بکەنەوە. بەڕاستی زۆر قورس بوو لەسەرم. هەفتەی یەکەم بەناخۆشی گوزەرا، هەر چۆنێك بێت لە هەفتەی دووەمەوە کەمێك هاتمەوە سەرخۆم. لە ڕاستیدا ئەوان لەسەر حەق بوون. ئەوەندە پێم لێڕاکێشابوو، وام نەدەزانی غەیری خۆم کەسی تر لەو ماڵەدا دەژی. حسابم بۆ کەس نەدەکرد، جا بۆ کەس دەیوێرا بەرهەڵستیم بکات! بەڵام لە سایەی ئەم کۆبوونەوانەوە، بۆم دەرکەوت کە مامەڵەی من وەک باوک هیچی تر نییە جگە لە نابەرپرسیارێتی، ڕەنگە ئەوان لە دڵی خۆیاندا وتبێتیان توخوا ئەوە باوکە. خۆشبەختانە هەفتەی چوارەم باشتر بووم. لە ناخی خۆمدا بڕیارم دابوو بە شێوەیەکی کارا بەشداری کۆبوونەوەکان بکەم. ئیتر لەو ڕۆژەوە بۆم دەرکەوت کە من زۆرداریم کردووە نەک باوکایەتی. بەڕاستی من ئێستا لە باوکایەتی تێدەگەم، گرفتی منداڵەکانم دەبینم، بێ ئەوەی لێیان تووڕە ببم، هەوڵ دەدەم پێکەوە بەدوای چارەسەردا بگەڕێین. خۆزگە زووتر بایەخی ئەم کۆبوونەوانەم بۆ دەردەکەوت."

## ٣- پێویستە یەکێك بەڕێوەی بەرێت

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی کۆبـوونەوەی خێزانـی ئەوەیە، کە سـەرۆکی خێـزان سەرپەرشـتی بەڕێوەچـوونەکەی بکـات. بەڵام ئەگەر بـاوکەکە ڕاهـاتبوو لەسەر ئەوەی زوو زوو بڵێت: "ئێوە خۆتان کۆ ببنەوە، دواتر لە بڕیارەکان ئاگادارم بکەنەوە." ئەوا ئامانجەکە نـایەتە دی. بەپـێچەوانەوە، پێویسـتە سـەرۆکی خێـزان بانگهێشـتی هەمـوو ئەنـدامانی خێـزانەکەی بکـات بـۆ ئەوەی لەدەوری مێـزی کۆبـوونەوە خـڕ ببـنەوە و دەسـت بـکەن بـا ئـاڵوگۆڕی بۆچـوون و دەربڕینـی هەستەکانیان. واتە لە مۆدێلی خێزانی تەندروستدا، سەرپەرشتیاری کۆبوونەوەکان باوکە. تا باوک وەستابێت، نابێت ئەو ئەرکە بدرێت بەسەر شانی دایکاندا.

## ٤- بەشداربوون بۆ ئەوانەیە کە گەیشتوونەتە تەمەنێکی دیاریکراو

ڕەنگە لێرەدا پرسیارێک بێت بە مێشکماندا: "ئایا پێویست دەکات هەمـوو ئەندامانی خێزان بەشداری بکەن؟"

لە وەڵامدا دەڵێین نەخێر، چـونکە تەمەنـی بەشـداربوون لە کۆبـوونەوەی خێزانیـدا سـنووردارە و تەنیـا ئەو ئەنـدامانە دەگـرێتەوە کە لە سـەروو (٧) ساڵەوەن. کاتێک یەکێک لە ئەنـدامانی خێـزان پـێ دەنێـتە (٧) سـاڵییەوە، لە مەراسیمێکی تایبەتـدا بانگێشـتی کۆبـونەوەکە دەکرێـت و بەخێرهـاتنی لێ دەکرێـت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێـت کە ئیـتر پێـی نـاوەتە قۆنـاغێکی نوێـوە و پێگەیەکی تایبەتی بەدەست هێناوە. کاتێک لەم ڕووەوە تەماشای کۆبوونەوەی خێزانی دەکەین، دەبینـین کە هاوکـارێکی مەزنە لە بەرەوپێشـبردنی گەشەی سۆزداریی منداڵدا.

لێرەدا خاڵێکی بچووك هەیە، پێم خۆشە لەسەری بوەستم: هەر چەندە تەمەنی بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکاندا (٧) ساڵییە، بەڵام دەبێت بزانین کە بەشداریکردن لە میکانیزمی بڕیاردان و دەنگداندا ئەو ئەندامانە دەگرێتەوە کە تەمەنیان (١٢) ساڵ یان بەرەو سەرەوەیە. لە (٧) ساڵییەوە ئاساییە منداڵ بە مەبەستی ڕاهاتن لەسەر کلتووری کۆبوونەوە، بەشداری بکات و گوێی لێ بگیرێت، بەڵام چونکە هێشتا گەشەی هزری تەواو نەبووە، ڕەنگە دژیەکیی زۆر بنوێنێت.

## ٥- کۆدەنگی بنەمای بڕیاردانە

مەرج نییە هەموو ئەندامانی خێزان هەمان بۆچوونیان هەبێت لەسەر بابەتێکی دیاریکراو، لەم بارەدا پەنا دەبرێتە بەر میکانیزمی دەنگدان بۆ یەکلاییکردنەوەی بڕیارەکان. ئەی ئەگەر دەنگەکان یەکسان بوون؟ لە وەها بارێکدا دەنگی سەرۆکی کۆبوونەوەکە کە باوکە، بە دوو دەنگ هەژمار دەکرێت.

**کۆبوونەوەی خێزانی ئەوە فێری منداڵ دەکات، ڕێز لە ماف و سنووری کەسانی تر بگرێت، لە ئاستێکی بەرزدا ئاڵوگۆڕی ڕای جیاواز بکات و بە سنگێکی فراوانەوە ئەنجامی کۆدەنگی قبوڵ بکات، ئەگەرچی وەک ئەوەش نەبێت کە خۆی خوازیاری بووە.**

با بڵێین خێزانێک لە کۆبوونەوەکەیاندا تاوتوێی ئەوە دەکەن کە پشووی هاوین بچن بۆکوێ. دایکەکە دەیەوێت بەخێزانی سەردانی ماڵە باوانی خۆی بکەن، باوکیشیان دەیەوێت سەردانی دۆست و هاوڕێ دێرینەکانی بکەن، بێگومان منداڵەکانیش

هەر یەکەیان بیرۆکەیەکی جیاوازی هەیە. با وا دابنێین گفتۆگۆکانیان هیچ ئەنجامێک نادات بەدەستەوە، لەم بارەدا پێویستە باوک داوای دەنگدان بکات. ئەگەر ئەنجامی دەنگدانەکە بە جۆرێک بوو کە هەفتەی یەکەم سەردانی ماڵی باوانی دایکیان بکەن، ئەوا پێویستە باوکیان ڕێز لە بڕیارەکە بگرێت و هەنگاوی کردەیی بنێت بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکە.

ئەو منداڵانەی لە کەشێکی خێزانیی وەهادا گەورە دەبن، بەکردەیی فێری ئەوە دەبن کە ڕێز لە ماف و سنووری کەسانی تر بگرن و لە ئاستێکی بەرزدا ئاڵوگۆڕی ڕا جیاوازەکانیان بکەن و بە سنگێکی فراوانەوە ئەنجامی کۆدەنگی قبوڵ بکەن، ئەگەرچی وەک ئەوەش نەبێت کە خۆیان خوازیاری بوون، وەک چۆن فێری ئەوە دەبن کە لە چاوی کەسانی ترەوە بڕواننە ڕووداوەکان.

## ٦- گیروگرفتەکانی خێزان لێرەدا چارەسەر دەکرێن

لەو خێزانانەدا کە میکانیزمی کۆبوونەوەی خێزانی بە شێوەیەکی کارا بەگەڕ خراوە، کەمترین ناکۆکی و بەریەککەوتن ڕوو دەدات، چونکە هەموویان دڵنیان لەوەی کە لە کۆبوونەوەدا کێشەکان قسەیان لەسەر دەکرێت و بەدوورودرێژی تاووتوێ دەکرێن. باش دەزانن کە مشتومڕی سەرپێی و بڕیاری تاکلایانە و پەلە هیچی لێ سەوز نابێت.

بەدەر لەوە، پچڕانی پەیوەندی و بەهەڵەتێگەیشتن کە دوو هۆکاری سەرەکین لەپشت زۆربەی کێشەکانی ناو خێزانەوە، لە ڕێگەی کۆبوونەوە و دانیشتنە خێزانییەکانەوە بۆ نزمترین ئاست دادەبەزێت. بەم شێوەیە پەیوەندییەکی بەرهەمدار و کراوە لەنێوان ئەنداماندا دێتە کایەوە و کەس هیچ لە دڵی خۆیدا گل ناداتەوە.

## ٧- منداڵان لێرەدا هەست بە بوون و کەسایەتیی خۆیان دەکەن

زۆر جار منداڵان لەبەر ئەوەی (هێشتا منداڵن)، لەلایەن باوانیانەوە فەرامۆش دەخرێن. منداڵ لە چاوی دایک و باوکیدا هەر منداڵە، جیاوازیی نییە خودای دەکرد (٧٠) ساڵ یان (٩٠) ساڵیش دەبوو. یان با بڵێین کچێک تەمەنی بووە بە (٢٠) ساڵ کەچی هێشتا دایک و باوکی بە چاوی منداڵەوە بۆی دەڕوانن، لە کاتێکدا ئەو خانمێکی لاوە و دنیای دەرەوە حسابێکی تری بۆ دەکەن. جا بۆیە ئەگەر خێزان لە کاتی خۆیدا ئەو پێگە و بەهایە نەدەن بە ڕۆڵەکانیان کە شایستەن، ئەوا لە دنیای دەرەوەدا بەدوای پێگە و بەهای خۆیاندا دەگەڕێن.

لەم ڕوانگەیەوە پێویستە کۆبوونەوەی خێزانی ئەو سەکۆیە بێت کە هەموو تاکێکی خێزان هەست بە بەها و گرنگیی خۆی بکات تیایدا.

## ٨- لەسەر مێزی ڕاوێژ ڕێگە نادرێت بە شەڕ و هەرا

لەو خێزانانەدا کە ماوەیەکی کەمە میکانیزمی کۆبوونەوەی خێزانی پەیڕەو دەکەن، زۆربەی کات دەبینین دەمەقاڵە دروست دەبێت. گرنگترین خاڵ لێرەدا ئەوەیە، لەم خێزانانەدا هەتا ڕێکەوتی کۆبوونەوە خێزانییەکان هەر باوک یاخو هەر دایک خۆی خاوەن بڕیار بووە، یان ڕەنگە یەکێک لە منداڵەکان هەتاکو ئەو کاتە هەموو شتێکی بۆ چووبێتە سەر، بەڵام چیتر ئەمە بەو جۆرە نابێت و ئیدی منداڵەکانیش و هاوسەرەکانیش ڕای خۆیان دەردەبڕن لەسەر بڕیارەکان. ئەمەش یەکەم نیشانەی گۆڕانی هاوسەنگییەکانی ناو ئەو خێزانەیە. ئەو ئەندامەی کە پێشتر هەموو شتێک هەر بەدڵی خۆی بووە، بۆی هەیە لە کۆبوونەوەکانی سەرەتادا هەست بە نائاسوودەییەک بکات و کۆمەڵە

داکۆکییەکی ناپێویست لە خۆی بکات، یـان ڕەنـگە مێـزی گفتوگـۆش جێ بهێڵێت. بەڵام ئەوەی کە پێویستە بکرێت ئەوەیە، بەهێمنی و بەئارامی هەوڵی لەگەڵدا بدرێت هەتاکو بەم کلتوورە تازەیە ڕادێت.

## ٩- پێویستە ئەو بڕیارانەی کە دەدرێت لە دەفتەرێکدا بنووسرێت

پێویستە کۆبوونەوە خێزانییەکان وەک قسەکردنی ئاسایی لێی نەڕوانرێت، بەڵکو وەک شێوازێکی کاریگەر مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. بـۆ ئەو مەبەستە پێویستە بڕیار و ڕاسپاردەی ناو کۆبوونەوەکان کە بەرهەمی کۆدەنگی و تەبایی گشتییە، تۆمار بکرێت. چونکە ئەو بڕیارانە لە حوکمی دەسـتووردان بـۆ ئەو خێزانە.

# له پەروەردەی منداڵدا پێویستە ڕەچاوی چی بکرێت؟



## پەروەدە و فێرکارییەکی تەندروست، پێویستە چی لە خۆ بگرێت؟

بابەتی پەروەردە و فێرکاریی منداڵ، یەکێکە لەو بابەتانەی کە قسەی زۆر هەڵدەگرێت. سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کە پەروەدە و فێرکاری دوو شتی جیاوازن. پەروەردە، بە دەستهێنانی ڕەوشتی بەرز لەخۆ دەگرێت. لە کاتێکدا فێرکاری، بەدەستهێنانی زانیاری و توانا و لێهاتنە لە بابەتێکی دیاریکراودا. بەو واتایەی مەرج نییە ئەو منداڵەی فێرکارییەکی باشی پێشکەش کراوە، خاوەن ڕەوشتی بەرزیش بێت.

لەناو خەڵکیشدا بەگشتی کە باس لە منداڵێکی پەروەردەکراو دەکرێت، مەبەست لەوەیە کە تا چەند خاوەنی بەها بەرز و باڵاکانە.

**"کوڕم تۆ نابیت بە پیاو!"**

دەگێڕنەوە باوکێک هەبوو کە هەمیشە بە کوڕەکەی دەوت:" کوڕم، بە خودا تۆ قەت نابیت بە پیاو!" کوڕەکەشی لە ڕقی باوکی، هەوڵ دەدات خوێندنەکەی زۆر بەسەرکەوتوویی تەواو بکات. دەچێتە دەرەوەی وڵات و لە بواری بەڕێوەبردندا بە بڕوانامەی زۆر بەرزەوە دەگەڕێتەوە و دەیکەن بە پارێزگار. لەو کاتەدا قسەکەی باوکی بیر دەکەوێتەوە، کە پێی دەوت تۆ نابیت بە پیاو. ئینجا بە شۆفێرەکەیدا هەواڵ دەنێرێت بۆ باوکی، دەڵێت: "بڕۆ بۆم

بانگ بکە با ببینێت کوڕەکەی بووە بە چی!" پاش ئەوەی باوکی دێتە ژوورەوە، لە سەر کورسییەکەی خۆیەوە بانگی باوکی دەکات و دەڵێت: "باوکە بیرت دێت تۆ بە منت دەوت قەت نابیت بە پیاو، دە ئیستا سەیرم بکە، نەک بووم بە پیاو، بەڵکو دەسەڵاتم هەیە بەسەر هەموو ئەم شارەدا و بووم بە پارێزگار."
باوکیشی بەغەمبارییەوە زەردەخەنەیەکی بۆ دەکات و دەڵێت: "کوڕم من کەی وتوومە تۆ نابیت بە پارێزگار، بوون بە پارێزگار زۆر ئاسانە، خوێندن تەواو دەکەیت و دەبیت، من وتم تۆ نابیت بە پیاو. ئەگەر ببوویتایە بە پیاو، دوای وەرگرتنی ئەم دەسەڵاتە، باوکت بانگ نەدەکردە بەر پێت و ئاوها بە لووتبەرزیەوە قسەی لەگەڵدا بکەیت، بەڵکو بە پێکانی خۆت دەهاتیت بۆ ئەوماڵەی کە تێیدا گەورە بوویت".
بەڵی، بەڕاستی بوون بە پیاو بە واتای بوون بە خاوەنی بەها مرۆییەکان دێت. خوێندن و گەیشتن بە پلەیەکی بەرزیش، بەرهەمی فێرکاری و خوێندنە.
لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، بە چاوی خۆتان دایک و باوکان دەبینین کە چەند بەپەرۆشن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان فێرکارییەکی باش بەدەست بهێنن. ئەوەتا لە دەمی خۆیان دەگرنەوە، بەس بۆ ئەوەی ئەوان بە شوێن و پلەوپایەی بەرز بگەن لە داهاتوودا. باشە، تۆ بڵێی ئەم دایک و باوکانە هەمان هەوڵ و تەقەلا بدەن بۆ ئەوەی منداڵەکانیان ببن بە خاوەن بیروباوەڕی پتەو و خۆیان بەو بەها باڵایانە ئارایشت بدەن کە پەسەندکراوی کۆمەڵگەن!
لە ڕاستیدا لە ئەنجامی بەدەستهێنانی فێرکارییەکی بەهێز و سەرکەوتوو، پسپۆڕی و کارامەیی بەرهەم دێت، بەڵام هەموو کەسێکی کارامە و خاوەن پسپۆڕ مەرج نییە پەروەردەیەکی باشی وەرگرتبێت، بەو واتایەی مەرج نییە هەڵگری بەها باڵا مرۆییەکان بێت، وەک؛ ڕێز و خۆشویستنی دەورووبەر و ڕەوشتی بەرز و ناسکی لە مامەڵەدا.

بۆیە لە کاتی پێشکەشکردنی فێرکارییەکی بەهێزدا، گرنگە ئاوڕی جددیش لە ڕەهەندی پەروەردەیی بدەینەوە، چونکە فێرکارییەکی خاڵی لە ڕەوشتە بەرزەکان، سوودێکی ئەوتۆ بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت.

## بەها باڵاکانی ئێوە کامانەن؟

زۆر گرنگە باوان خۆیان بزانن کە ئایا پشت بە کام بەهایانە دەبەستن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیاندا، بەها باڵا گەردوونییەکان، بیروباوەڕە ئایینییەکان، کلتوور و نەریت لە نموونەی ئەو بەهایانەن.

## چ خێزانێك، چ شتێکی بەلاوە ئاساییە؟

هەموو خێزانێک بە شێوەیەکی ئاگایانە یاخود نائاگایانە لەژێر کاریگەریی کۆمەڵە نۆرمێکدان (بنەمایەکدان). با وا دابنێین کوڕێکی تەمەن (١٦) ساڵ بە خێزانەکەی دەڵێت: "من دەمەوێت گوارە لەگوێ بکەم!" وەڵامی ئەم خێزانە بۆ داواکاریی کوڕەکەیان بەو سەرچاوەیە ئاشنامان دەکات، کە ئەم خێزانە لە بڕیارەکانیاندا بۆی دەگەڕێنەوە. ئەگەر بێتوو ئەمە منداڵی خێزانێک بێت کە پشت بە کلتووری ڕۆژئاوا ببەستن لە پەروەردەی منداڵەکەیاندا، ئەوا وەڵامیان بۆ ئەم داوایە بە جۆرێک دەبێت کە ڕەنگە بڵێین یەکەم گوارەش خۆمان بۆت دەکڕین. بەڵام ئەگەر خاوەن تێڕوانینێکی ڕۆژهەڵاتییانە بن، ئەوا ڕەنگە هەڵوێستێکی سەرتاپا جیاوازیان هەبێت.

ئێستاش بە لەبەرچاوگرتنی مامەڵەی ئەم دوو خێزانە، با شیکارییەک بۆ شێوازی پەروەردەکەیان بکەین:

هۆکاری ئەوەی لە خێزانی یەکەمدا زۆر بەئاسایی حاڵەتەکەیان وەرگرت و پشتگیریشیان کرد، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەمە لە نۆرمەکانی ئەم خێزانەدا

شتێکی باوە و نـامۆ نـییە بەلایـانەوە. خـۆ هەر ئەم منـداڵە ئەگەر داوای ئەوە بکات ملوانکەیەک لەمل بکات کە مەدالیایەکی کەعـبەی پێـوە بێـت، ڕەنگە ڕێـگەی پـێ نەدەن و داواکەی ڕەت بـکەنەوە، لەبەر ئەوەی خواسـتێکی لەو جۆرە بە نۆرمەکانی خێزانەکەیان نـامۆیە. کەواتە بڕیـاردان لەسـەر ئاسـاییبوون و نائاساییبوونی ڕەفتارەکانی منـداڵ بەگـوێرەی پـێگەی جـوگرافی و شـێوازی پەروەردەی خێزانەکە دەگۆڕێت.

ئیتر ڕەنگە سەرەتای کێشەکەش لێرەوە بێت، کاتێک منداڵ بە دنیای دەرەوە ئاشنا دەبێت، ڕەنگە حەز لە جێبەجێکردنی هەندێک یاسا و بەهای تر بکـات کە بە خێـزانەکەی خـۆی نـامۆیە، ئەمەش وا دەکـات کە لەگەڵ خێزانەکەیـدا تووشی ناکۆکی ببێت.

## ئاساییبوون و نائاساییبوون بەگوێرەی چی دیاری دەکرێت؟

لەم سـەردەمەدا تەنـانەت لە هەمـان گەڕەکیشـدا شـتێکی ئاسـایی و چاوەڕوانکراوە، کە چەندین خێزانی خـاوەن بەهـا و کلتـووری جیـاواز بوونیـان هەبێت. کە وا بێت پێویستە نۆرمەکان بەگوێرەی چی پەسـەند و پەیـڕەو بکـرێن؟ خاڵی دەستپێك دەبێت چی بێت؟

زۆرێـک لە خێزانەکـان ئەو سـەرچاوەیەی کە لە پەروەردەی منداڵەکانیانـدا بۆی دەگەڕێـنەوە، بـریتییە لەو بیروبـاوەڕەی پەیـڕەوی دەکەن. هەر ڕەفتارێک لە چوارچێوەی بیروباوەڕەکەیانـدا جێـی نەبێـتەوە، بە نائاسـایی لەقەڵەمـی دەدەن. بەشێکی تـری خێزانەکـان بەگـوێرەی دابـونەریتی ئەو نـاوچەیەی تێیـدا دەژین، هەڵسەنگاندن بۆ ڕەفتاری منـداڵەکانیان دەکەن. شـایانی باسـە جیـاوازیی نێوان ئەم دوو تێڕوانینەش، کۆمەڵێک گرفت بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

> بۆ ئەوەی منداڵ نۆرم و بەهاکانی خێزانەکەی قبوڵ بکات، سەرەتا پێویستە خێزانەکەی ئەویان قبوڵ کردبێت.

هەنـدێک جـار خێـزانەکە خـۆی لە سلێمانی دەژی، منداڵەکەشـی لە زانکـۆیەک لە ڤییەننـا دەخوێنێـت، ئەگەر ئەم خێـزانە لە پەروەردەی منداڵەکانیاندا بە ڕێژەیەکی بەرچاو پشتیان بە نەریـت و کلتـووری نـاوچەکەی خۆیان بەستبێت، ئەوا شتێکی چـاوەڕوانکراو دەبێـت ئەگەر منـداڵەکەیان بکەوێـتە ژێـر کاریگەریی نۆرم و کلتووره باوەکانی ڤیەنناوە، چونکە لە بارێکی وەهـادا ئەگەری ئەوە هەیە ئەو منداڵە هەستی بە فشاری کۆمەڵگا کردبێت لە هەندێک ڕووەوە.

کە وا بێت گـرنگە بـاوان بەوردی لەو سـەرچاوانە بکـۆڵنەوە، کە لە پەروەدەی ڕۆڵەکانیاندا بۆی دەگەڕێنەوە. واتە پێویستە بە شـێوەیەك بـن، منـداڵ ڕوو لە هەر جێیەک بکـات گۆڕانکـاری بەسـەر ڕەفتـار و هەڵسـوکەوتیدا نەیەت، چـونکە کاتێک حەز بە نۆرمی شوێنێک دەکات و هی خێزانەکەی خـۆی لەبیـر دەکـات، کە دەگەڕێتەوە ناو خێزانەکەی هەست بە جیاوازی و نامۆیی دەکات.

## ماڵی لانە لە گوندێکی دوورە دەستەوە بەرەو شارێکی گەورە دەگوازنەوە.

کاک هیوا و خێزانەکەی مـاوەی چەنـد سـاڵێکە لە گونـدێکی دوورەدەسـتدا ژیان بەسەر دەبەن. کاتێک لانەی کچیـان نـاوی لە زانکـۆ دێـتەوە، بڕیـار دەدەن ماڵ بگوازنەوە بۆ شار.

لە سەرەتادا هەموو شتێک زۆر بەباشـی دەڕوات، بەڵام پـاش مـاوەیەک لانە بە هۆی وانەخوێندنەوە درەنگ دەگەڕێتەوە مـاڵەوە. باوکیشـی ئەمەی پێناخۆشـە، بەڵام لانە هەر جەخـت لەسـەر ئەوە دەکـاتەوە کە ئەو لەمەدا خەتـای نیـیە و

دەرچـــوونی لە وانەکانـــدا بەنـــدە بەوەی کە لەگەڵ هاوڕێکانیـــدا بەهەرەوەزی کۆشش بکات. هەر چەندە باوکی بەم وەڵامە قایل نابێـت، بەڵام هـیچ ناڵێت و نایکـات بە ناخۆشـی. ڕۆژێکیـان لانە دێـتەوە و داوای ڕوخسـەت دەکـات بـۆ ئەوەی بچێت بـۆ ئـاهەنگی یـادی لەدایکبـوونی هاوڕێیەکیـان لە شـارێکی تـر. دایک و باوکی بەمە تووڕە دەبن و ڕوخسەتی نـادەن. لانە بەمە نـاڕەحەت دەبێـت و لەسـەر دڵـی زۆر قـورس دەبێـت، بـۆیە ئیـتر لەو ڕۆژەوە لەگەڵ هاوڕێکانیـدا بەخراپە باسی ماڵەوەیان دەکـات و لێیـان دەخوێنێـت. ئەمەش یەکەم جـارە لای کەسانی بێگانە، قسە بە دایک و باوکی بڵێت.

پـاش مـاوەیەک زیـاتر لە هاوڕێکـانی نزیـک دەبێـتەوە، بەو ئەنـدازەیەش لە خێـزانەکەی دوور دەکەوێـتەوە. وای لـێ دێـت ئیـتر لەگەڵ هاوڕێکانیـدا هەر خەریکی سەردانیکردن و کاتبەسەربردنی درەنگەشـەوان دەبـن، بەڵام هـیچ کـام لەو شـتانە لای مـاڵەوە بـاس ناکـات، چـونکە ترسـی ئەوەی هەیە ڕێـگەی لـێ بگرن.

ڕۆژێکیـان لانە لەگەڵ هاوڕێیەکیـدا بە تەلەفـۆن قسـە دەکـات. لە میـانەی قسەوباسـدا، ئامـاژە بـۆ ئەوە دەکـات کە بـاوانی زۆر لێـی تـووڕە دەبـن و دەیشکێننەوە. دایکی لەودیـو دەرگـاکەوە گوێبیسـتی ئەم قسـانە دەبێـت، خـۆی پێناگیرێت و خۆی دەکات بە ژووردا، هـاوار دەکـات بەسـەریدا: " ڕۆڵە، شـەرم ناتگرێ بە خراپە باسـی خێزانـی خـۆت دەکەیـت لای ئەم و ئەو؟ باوکـت لەبەر خاتری تۆ خەو و خـۆراکی لە خـۆی تێـک داوە. لەبەر خوێنـدنی تـۆ وازمـان لە هەمـوو کاروبـارێکی گونـد هێنـاوە و هـاتووینەتە ئەم شـارە گەورەیە. ئـا ئەمەیە پاداشتی تۆ بۆ ئێمە؟"

لەبەرامبەردا لانە هیچ خۆی تێک نادات، تەنانەت تەلەفـۆنەکەش بە گـوێیەوە لا نابـات. ئەوجـا بەپـۆزێکەوە ڕوو دەکـاتە دایکـی: "دایە، مـن هـیچ شـتێکی

نائاساییم نەکردووە، بەڵکو ئەوە ئێوە ڕەفتاری نائاسایی دەنوێنن." دایکیشی بەمە زۆر پەست دەبێت و هاوار دەکات بەسەریدا: "ئەوە تۆیت بێ ئەدەبی دەکەیت! تۆ بڕوانە، هێشتا جەنابی پێمان دەڵێت ئێوە نائاساییین!" ئەمە دەڵێت و ئینجا تەلەفۆنەکەی لێ دەستێنێت و بەبێ ئەوەی بزانێت کێیە، دەست دەکات بە قسەکردن: "ئەری باشە ئێوە خوداتان نییە؟ ئیمانتان نییە؟ بۆچی واتان لە کچەکەم کردووە؟ پێشتر لە ڕووی نەدەهات لەلای باوکی دەم بکاتەوە، ئێستا وای لێ هاتووە قسەمان پێ دەڵێت و بەرپەرچمان دەداتەوە."

- پووری گیان، لەسەرخۆ بە. ئێمە هیچ شتێکی نائاساییمان نەکردووە.

- بۆ ناشێ بڵێی ئەوەی ئێوە دەیکەن ئاساییە؟.

- پووری گیان واز بێنە، ئێرە شارە شار، گوند نییە!.

- کچم، ڕەوشت لە هەموو شوێنێک هەر ڕەوشتە، بێ ڕەوشتییش لە هەموو جێیەک هەر بێڕەوشتییە. ڕەوشت کوا گوند و شاری بۆ هەیە!.

وەک دەبینن بە هۆی نۆرمەوە، چۆن ئەم کچە گەنجە لەگەڵ خێزانەکەیدا تووشی ناکۆکی بووە. بەلای ئەمەوە لە شاردا هەر چی بکرێت ئاساییە، بەلای باوانیشیەوە ڕەفتاری کچەکەیان نائاساییە.

باری ئاسایی و نائاسایی بەپێی چی دەگۆڕێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەوپەڕی ئاڵۆزیدایە، بەڵام لێرەدا قسەکانی دایکەکە جێی تێڕامانە کە دەڵێت: "ڕەوشت شار و گوندی بۆ نییە." ڕەفتارە ئاساییەکان ئەو هەڵسوکەوتانەن کە لەلایەن ئایین و ڕەوشت و بەها باڵا گەردوونییەکانەوە پەسەند کراون. ڕەوشتیش لەلای ئەو کەسانەی کە هەمان کلتوور و باوەڕیان هەڵگرتووە، هەمان واتا و ڕەنگدانەوەی هەیە. ئەگەر ڕەفتارێک لە گونددا بە بێڕەوشتی لەقەڵەم بدرێت، ناکرێت لە شاردا سیمبولی ڕەوشتبەرزی بێت، بەڵام بۆی هەیە هەندێک جیاوازی بوونی هەبێت.

## بۆچی منداڵان لەگەڵ خێزانەکانیاندا تووشی پێکدادان دەبن لەسەر نۆرمەکان؟

وەک ئاشکرایە هەموو دایک و باوکێک ئاواتی ئەوەیە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی منداڵەکەی لە سنووری ئەو نۆرم و بەها باڵایانەدا بسووڕێتەوە، کە لەلایەن کۆمەڵگەوە پەسەند کراون. ئەی هۆکار چییە هەندێک جار منداڵان کۆمەڵە داوایەکیان لە خێزانەکانیان هەیە، کە بە نائاسایی دادەنرێن و لەگەڵ نەریت و نۆرمە باوەکاندا یەک ناگرنەوە؟ چی وای کردووە ئەم منداڵە خاوەنی بیروباوەڕێکی جیاواز بێت لەوەی خێزانەکەی؟ لە کاتێکدا هەر ئەوان بوون کە لە خۆشی و ناخۆشیدا بەدەمیەوە بوون و بەردەوام دەستیان پێوەی بووە؟

> **پێویستە دایک و باوکان لەسەر بنەمای دادپەروەری مامەڵە لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن، دروست نییە گەورە و بچووک هەمان شێوازیان لەگەڵ بەکار بهێنرێت.**

منداڵ لەگەڵ هاتنە دنیایدا، بە چەندین قۆناغی فێربووندا تێدەپەڕێت. داخوازی و بەرهەمی هەر قۆناغێکیش جیاوازە لە هی قۆناغێکی تر، بەڵام ئەگەر بێتوو خێزان شارەزایی نەبێت سەبارەت بەوەی منداڵەکەی لە چ قۆناغ و تەمەنێکدا چ حەز و خولیا و توانایەکی هەیە بۆ فێربوونی شتەکانی دەوروبەری، ئەوا ڕەنگە نۆرمێکی نەگونجاو بۆ ئەو قۆناغەی بگوازێتەوە. واتە ئەگەر ئەو بابەتەی کە منداڵ دەیەوێت فێر ببێت، جیاواز بێت لەو بابەتەی کە خێزانەکە هەوڵ دەدات فێری بکات، ئەوا خێزان لەم بارەدا لە گەیاندنی نۆرمەکانی خۆی بە منداڵەکەی گرفتی بۆ دروست دەبێت. واتە هەر وەک چۆن کارێکی دروست نییە لە وانەی بیرکاریدا بابەتی بڕە جەبرییەکان بۆ

منداڵێکی سەرەتایی باس بکرێت، بە هەمان شێوە پێویستە دایک و باوک بزانن لە چ قۆناغێکدا چ بابەتێک فێری منداڵەکەیان دەکەن.

بەکورتی، پێویستە باوان ئاگایان لە پێداویستییەکانی قۆناغی گەشەی جگەرگۆشەکەیان بێت. ئەگینا لە دواییدا دەکەونە گلەیی و دەڵێن: "ئای زەمانە! لە دەمی خۆمان گرتەوە بۆ ئەوان، کەچی ئەوانیش ئاوەها بێوەفا دەرچوون."

## چ کاتێك ڕەفتارە نائاساییەکان لە منداڵدا زەق دەبێتەوە؟

مەرجی سەرەکی بۆ ئەوەی منداڵ بیروباوەڕ و نۆرمی خێزانەکەی پەسەند بکات و لە ژیانیدا ڕەنگ بداتەوە، ئەوەیە خێزانەکەی خۆش بوێت و ئەوانیش ئەمیان خۆش بوێت. خۆشویستن بە مانا قووڵە فێرکارییەکەی، واتە کە منداڵ هەست بکات خۆش ویستراوە و بەلای خێزانەکەیەوە گرنگە. کاتێک هەستی بەمە کرد، ئیتر هەستی لایەنگری بۆ خێزانەکەی زیاد دەکات. ڕەنگە زۆرێک لە باوان لە کاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانەدا، شتێکی لەم جۆرە بە خەیاڵیاندا بێت: "جا بۆ هیچ خێزانێک هەیە منداڵی خۆی بەلاوە گرنگ نەبێت!" لە ڕاستیدا گرنگیپێدان و خۆشویستنی منداڵ تەنها لە چوارچێوەی بەخێوکردندا خۆی نابینێتەوە. بەڵێ، لەسەر ئەوە کۆکین کە هەموو دایک و باوکێک منداڵی خۆی خۆش دەوێت، بەڵام ئەی ئەگەر ئەو دایک و باوکە بە زمانی حاڵ و ڕەفتار پەیامێکی تریان دەگەیاند، ئەوکات چی؟ لە وەها بارێکدا، زۆربەی جار منداڵ لە ناخی دڵەوە خوازیارە سەر بە خێزانەکەی نەبێت، بگرە دوور نییە نەفرەت لە کلتوور و بیروباوەڕیشیان بکات، چونکە بواریان بۆ نەڕەخساندووە گوزارشت لە هەستەکانی بکات. بە شێوەیەکی گشتی ئەو منداڵانەی لەناو خێزاندا دڵنیایی بەدەست ناهێنن، هەوڵ دەدەن لەدەرەوە ئەو بۆشاییە پڕ

بکەنەوە. تەنانەت هەندێک جار ڕەنگە ئەو کەسە یان ئەو تاقم و گرووپە وەک بەدیلی خێزانەکەی ببینێت. لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەو گرووپە/کەسانە لە خێزانەکەی زیاتر بەدەمیەوە بچن و حسابی بۆ بکەن و لە هەستەکانی تێبگەن، بەئاسانی وابەستەیان دەبێت و پێداویستییە سۆزییەکانی بەوان پڕ دەکاتەوە. ئاشکرایە مرۆڤ بە سروشتی خۆی، لایەنگری بۆ شوێنێک یان بۆ کەسانێک دەبێت، کە هەست دەکات ڕێزی لێ دەگرن و لێی تێدەگەن. لە حاڵەتێکی وەهادا، دەگونجێت کوڕێکی تازەپێگەیشتوو بە ڕووی دایکیدا هەڵبشاخێت و بیەوێت لاسایی گرووپە هاوڕێکەی بکاتەوە: "ئیتر من گوارە لەگوێ دەکەم، کەسیش ناتوانێت ڕێگریم لێ بکات." لێرەدا ئەگەر گوارە لەگوێکردن لە خێزانەکەدا شتێکی قبوڵکراو نەبێت، ئەوا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوە، چونکە چیتر ئەم منداڵە پابەندی نۆرمەکانی خێزانەکەی نییە و بەدیلیشی دەست کەوتووە.

ڕەنگە پرسیارێک بێتە پێشەوە و بوترێت ئەو منداڵانە بۆ ئاوەها جیاواز دەردەچن؟ بۆچی پابەندی نۆرم و نەریتی خێزانەکەیان نابن؟ یاخود بۆچی بێوەفا دەردەچن بەرامبەر باوانیان؟ لە کاتێکدا ئەوان هەر چییان هەیە و نییانە خستویانەتە بەر دەستی؟

**ویژدانی منداڵ هەر وەک ئاوێنەیەکی ساف و بێگەردە، جێگەی ئەو کەسانەی تیادا نابێتەوە کە درۆ دەکەن و بەرژەوەندیخوازن. با ئەو کەسانە دایک و باوکیشی بن.**

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەتوانین بڵێین: منداڵ لەو کاتەی کە لەدایک دەبێت، ماوەیەکی دیاریکراو لەگەڵ دایکیدا بەسەر دەبات، تاکو بنەماکانی پەروەردەی لێوە فێر دەبێت. ئەم ماوە

دیاریکراوە تا تەمەنی هەرزەکاری بەردەوام دەبێت، کە نزیکەی (١٣-١٤) ساڵە. ئەگەر دایەکەکە توانیبێتی بەحەکیمانە ئەم چەند ساڵە بەسەر بەرێت لەگەڵی، بەرهەمی ڕەنجەکەی لەدوای ئەم قۆناغە دەچنێتەوە. خۆ ئەگەر حاڵەتێکی پێچەوانەی ئەمە لەئارادا بێت، ئەوسا سزانەدان و تۆڵەنەسەندنەوە لە دایک و باوک بۆ ویژدانی منداڵەکە دەمێنێتەوە.

## چی وا دەکات بەهاکانی خێزان لە منداڵدا ڕەنگ نەداتەوە؟

### ١- ئەگەر منداڵ لەناو خێزانەکەیدا هەست بە بەها و گرنگیی خۆی نەکات

هەر وەک دەزانن بە تێپەڕبوونی کات و بڕینی قۆناغەکانی گەشەکردن، دنیابینیی منداڵ و تێڕوانینەکانی گۆڕانکاریی بەسەردا دێت، ئەمەش دۆخێکی سروشتییە. لەبەر ئەوەی منداڵ لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە تاکێکی سەربەخۆیە و جودایە لە باوانی. دار و درەختەکانی دارستانیش بەو جۆرەن. ڕاستە هەموویان لە دوورەوە لەیەک دەچن و لە هەمان جێگەدان و لە هەمان خاک و خۆڵەوە خۆراک وەردەگرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەس ناتوانێت نکوڵی ئەوە بکات کە لە ڕووی وەرگرتنی خۆراک و گەڵاڕێزانەوە، هەر یەکەیان بەگوێرەی سروشتی خۆی کاردانەوەی هەیە. بە هەمان شێوە، منداڵ هەر چەندە لە باوانیشی بچێت، بەڵام ژیانێکی

> نرخ و بەهای ئەو ڕەوشت و ئاکارانەی منداڵ لە باوانییەوە فێر دەبێت، بە ئەندازەی نرخ و بەهای خودی باوانە لەلای منداڵەکە.

جودای هەیە و خاوەنی کەسێتییەکی تایبەت بە خۆیەتی.

بۆ نموونە؛ گریمان دایکێک حەزی لە سەیرکردنی زنجیرە درامایە، منداڵەکەشی تامەزرۆی وێنەکێشانە. دایکەکە چووەتە قووڵایی دراماکەوە، منداڵەکەشی بە دنیای هونەرەوە سەرقاڵە و خەریکی کێشانی وێنەی ئەو چۆلەکەیە کە بەسەر درەختی حەوشەکەیانەوە نیشتووەتەوە. منداڵی ژیکەڵە لە کێشانی وێنەکەی دەبێتەوە و دەیەوێت پیشانی دایکی بدات و بزانێت کاردانەوەی چۆنە.

گومانی تێدا نییە، کاردانەوەی دایک لەو کاتانەدا زۆر گرنگە. ئەگەر هەر بەدەم سەیرکردنی دراماکەیەوە بڵێت: "ئا... ئا بەقوربان زۆر جوانە!" ئەم حاڵەتەش چەند جارێک دووبارە بێتەوە، ئەوا بە تێپەڕبوونی کات ئەو دایکە ئەم پەیامە نەرێنییە لە ناخی منداڵەکەیدا دەچەسپێنێت: "تۆ توانای ئەوەت نییە لەم ماڵەدا خۆت بسەلمێنێت!" یان با وا دابنێین منداڵەکە حەزی لە یاریی باسکەیە، بەڵام باوکی بەزۆر دەیخاتە خولی دووگۆڵییەوە، تەنها لەبەر ئەوەی خۆی بە منداڵی حەزی لە دووگۆڵی بووە! وا بزانم پێشبینیکردنی حاڵەتی ڕۆحی ئەو منداڵە سەخت نییە! هەر چییەک دەکات، دڵی پێوەی نانوسێت و خەیاڵی لای یاریی باسکە دەبێت. ئەمەش ئەو پەیامە بە منداڵ دەدات، کە تۆ ناتوانیت حەز و خولیاکانت بەجێ بهێنیت.

بۆیە لەم ڕووەوە ئەگەر خێزان خواست و تواناکانی منداڵ بەهەند وەرنەگرێت و حەز و خولیاکانی خۆی بەسەردا بسەپێنێت و مافی هەڵبژاردنی بۆ نەهێڵێتەوە، کاتێک ئەو منداڵە گەورە دەبێت، ئەم پرسیارە لە خۆی دەکات:

> **یەکێک لە هۆکارەکانی دابڕانی منداڵ لە خێزانەکەی ئەوەیە، ئەندامانی خێزان یارمەتیی نادەن لە هەڵگرتنی بارەکانی سەرشانی.**

"ئەرێ بەڕاست من چیم؟" بە مانایەکی تر، کاتێک منداڵ لەناو خێزانەکەی خۆیدا هەست بە بوونی خۆی ناکات و حسابی بۆ ناکرێت، دەکەوێتە گەڕان بەدوای کەسێک یان لایەنێکدا کە لە هەستەکانی تێبگات و پێداویستییەکانی بۆ پڕ بکاتەوە. هەر وەک بڵێی لە ڕووی سۆزدارییەوە لە خێزانەکەی خۆی دادەبڕێت، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا کەس گەرەنتی ئەوە دەکات، هەموو جارێک ڕێی لە کەسێکی باش و خاوەن متمانە بکەوێت؟

ئەگەر باوان نەتوانن تێبینیی ئەم دابڕانە بکەن، ئەوا بۆی هەیە ڕۆژێک منداڵەکەیان بە کۆمەڵە داوایەکی جیاوازەوە ڕووبەڕوویان ببێتەوە. خۆ کە ئەمە ڕووی دا، سەرسامی و خۆشڵەژان هیچ مانایەکی تێدا نامێنێتەوە، چونکە ئیتر خۆی دەزانێت چیی دەوێت، هەموو جۆرە بەرهەڵستی و ڕێگرییەکیش جگە لە کاتبەفیڕۆدان هیچی تر نییە.

کە وا بێت باشترین ڕێنمایی بۆ دایک و باوکانی ئازیز ئەوەیە، بە شێوەیەك ڕەفتار نەکەن ڕۆڵەکانیان لە خۆیان تەرا بکەن. بە هیچ هۆکارێک منداڵەکەتان تەریق مەکەنەوە و ڕووشکێنی مەکەن. کارێک بکەن، شانازی بکات بەوەی کە بەشێکە لەو خێزانە گەورەیەی کە لە خاڵ و مام و ئامۆزا و خاڵۆزاکانی پێک هاتووە.

## ٢- ئەگەر ئەو پێگەیەی نەدرێتێ کە تەمەنەکەی داخوازیەتی

مەبەست چییە لە پێگەی شایستە و بە چ شێوەیەک دەدرێت بە منداڵ؟ وەڵامی ئەم پرسیارەمان لە لاپەڕەکانی پێشوودا بە چەندین شێوەی جیاواز داوەتەوە. ئەگەر بەکورتی تیشکێک بخەینە سەری، ئەوا دەڵێین: منداڵ لەگەڵ هەنگاونانی بۆ هەر قۆناغێکی جیاواز لە تەمەنیدا، کۆمەڵە گۆڕانکارییەکی جەستەیی و دەروونی تێدا ڕوو دەدات. بۆ نموونە؛ منداڵێکی

تەمەن (٧) ساڵ، نایەوێت وەک تەمەن (٥)ساڵێک ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت.

لەبەر ئەوەی لە ڕووی زانستی فێرکاری، (٧) ساڵی قۆناغێکی زۆر گرنگە لە ژیانی منداڵدا، پێویستە پێگەیەکی شایان بەو قۆناغەی بدرێتێ و هەست بکات کە ڕێزی لێ دەگیرێت، چونکە هەرچەندە هێشتا منداڵیشە، بەڵام نایەوێت (وەک منداڵ) ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێت. واتە دەیەوێت یاری بە کەسایەتیی نەکرێت و گاڵتەی پێ نەکرێت. خۆ ئەگەر خوشک یان برای لە خۆی بچووکتری هەبێت، ئەوا باشتر وایە وەک (دادە) یان (کاکە) بۆی بڕوانرێت. کاتێکیش بێڕێزییەک لەلایەن خوشک و برا بچووکەکانەوە نوێنرا بەرامبەری، ئەوا دەبێت یەکسەر خۆهەڵقورتێنرێت و ئەو پەیامە بگەیەنرێت کە ئەم منداڵە ئیدی خاوەنی پێگەیەکە کە شایانی ڕێزە.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەم کە ئەمە تەنها منداڵانی تەمەن (٧) ساڵ ناگرێتەوە، بەڵکو منداڵ کە دەگاتە (١٤) ساڵیش بە هەمان شێوە پێویستی بەوەیە هەست بکات پێگەیەکی جیاوازتری هەیە، چونکە ئیدی لە قۆناغی هەنگاونانداییە بەرەو بوون بە کەسێکی پێگەیشتوو. لەم قۆناغەدا کە هەرزەکار بەدوای ناسنامە و کەسێتیی خۆیدا دەگەڕێت، زۆر گرنگە حسابی بۆ بکرێت و ڕای وەربگیرێت، دەنا دەرئەنجامی نەخوازراوی دەبێت و کارێک دەکات کە لە خێزان و لەو بەهایانەش دوور بکەوێتەوە کە لەوماڵەدا هەیە.

ئەگەر خێزان لە وەختی خۆیدا ئەم پێگەیە بە منداڵ نەبەخشێت، هەر بە (هەتیو) و (خوێڕی) بانگی بکات و حسابی مرۆڤی بۆ نەکات، ئیتر ئەو نرخ و بەهایەی کە لە خێزانەکەی دەستی ناکەوێت، هەوڵ دەدات لە هاوڕێکانی یان گرووپێکی توندڕەو یاخود لەناو دز و جەردەکاندا بەدەستی بهێنێت و وابەستەی ئەوان بێت.

بۆ نموونە؛ چەتەیەک زۆر بەئاسایی پێگەیەکی ڕێزدار دەدات بە منداڵێکی (١٥) ساڵ. ڕاستە حسابی پیاوی بۆ دەکـات، بەڵام داواکارییەکـانی کـۆمەڵە کارێکی نامرۆڤانە و نەشیاون، وەک پەلاماردانی خەڵـک و ڕاووڕووتکـردن. بەڵام ئەو بە چەشـــنێک پەروەردەی دەکـــات، کە وا هەســـت بکـــات ئەو ڕەفتارانەی لێ دەوەشێتەوە.

### ٣- ئەگەر گومانی هەبێت لە دڵسۆزیی باوانی

لەو ساتەوە کە منداڵ چـاو بە دنیـا هەڵـدەهێنێت، یەکەم کەس کە دەبێـتە کانگای دڵنیای و متمانە بۆی، دایک و باوکیەتی. چـونکە ئەوان دەیپـارێزن و پێداویستییەکانی بۆ دەستەبەر دەکەن. ئیدی لێرەوە ئەو پەیامەی پێدەگات کە: "ئەم دوو مرۆڤە قەت سووکایەتیت پێ ناکەن، ئەها کە برسـیت دەبێـت شـت دەخەنە بەر دەستت، کە تینووت دەبێت یەکسەر ئـاوت بـۆ دەهێـنن!" منـداڵ بەردەوام دەبێت لەم بیرکردنەوانە، هەتا ئەو کاتەی گوێبیستی کۆمەڵە شـتێکی نەرێنی دەبێت لەلایەن باوانیەوە لەسەر خۆی، یان کە دەبینێت هەندێک جـار درۆی لەگەڵ دەکەن و ڕاستییەکانی لێ دەشارنەوە و هەڵی دەخەڵەتێنن، ئیـتر بەو جۆرە وردە وردە متمانەی کاڵ دەبێتەوە. ناخی منداڵ پـاک و بێخەوشـە، زەحمەتە کەسانی درۆزن و بەرژەوەندیخواز لە ناخی ئەودا جێگەیان ببێـتەوە، جا خودای دەکرد دایک و باوکیشی دەبوون.

## ئەگەر باوان کەوتنە داوی ئەو شتانەی کە خۆیان فێریان کردووە...

زەنگی تەلەفۆن لێدەدات، تارا دەچێـت وەڵامـی تەلەفـۆنەکە بـداتەوە. کە هەڵی دەگرێت، دەزانێت پوورە نازداری هاوڕێی دایکییەتی، بەڵام لەو کاتەدا

دایکی دەرفەتی نییە قسەی لەگەڵ بکات. بۆیە بە تارا دەڵێت: "بڵێ دایکم لە ماڵ نییە!" ئەویش بەقسەی دایکی دەکات و دەڵێت دایکم لە ماڵ نییە.

لێرەدا دایکەکە بە نائاگایی، بێمتمانەییەکی گەورە لە ناخی منداڵەکەیدا دروست دەکات، لەبەر ئەوەی بە ڕۆژی ئاشکرا لەبەر چاوی کچەکەی درۆ دەکات. ئەمە لە کاتێکدا لە منداڵییەوە باسی خراپی و قێزەونیی درۆی بۆ کردووە و ئامۆژگاریی کردووە کە نابێت متمانەی بەو کەسانە هەبێت کە درۆ دەکەن.

لەم بارەدا کچەکەی لێکدانەوەیەکی لەم جۆرە بۆ ڕووداوەکە دەکات: یان ئەو شتانە هەڵەن کە لە منداڵییەوە دایکی بۆی باس دەکات، یا ئەوەیە دایکی کەوتووەتە داوی ئەو شتانەی کە خۆی فێری کردووە.

### ٤- ئەو کاتەی منداڵ متمانەی بە باوانی نامێنێت

گریمان دایک و باوک لەبەر چاوی منداڵەکانیان، دەربارەی مەسەلەیەک دەبێتە دەمەقاڵەیان. دەمەقاڵە توند دەبێتەوە، بە شێوەیەك دایک و باوکەکە قسەی ڕەق و نەشیاو بە یەکتر دەڵێن. ئەو دایک و باوکەی لە زیهنی منداڵدا وەک شتێکی پیرۆز نەخشێنرابوو، ئەم دیمەنەی ئێستایان لەپڕ هەموو شتێک سفر دەکاتەوە و، ڕێز و شکۆیان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. ئەوجا دەست دەکات بە پێداچوونەوەی تێڕوانینەکانی بۆیان: "ئەو باوکەی ئەو هەموو ڕێزەم لێ دەگرت، ئا ئەمەیە کە بێڕێزی دەنوێنێت بەرامبەر دایکم و هێرش دەکاتە سەری!".

بەکورتییەکەی، منداڵ بە هێندەی ڕێزگتنی لە باوانی، ڕێز لەو بەهایانە دەگرێت کە لەوانەوە فێری دەبێت، چونکە ڕێزگرتنی لەو بەهایانە لەبەر پیرۆزی و گەورەیی ئەوانە. واتە کاتێک منداڵ متمانەی بە باوانی کەم

دەبێتەوە، بە هەمان شێوە متمانەی بەو شتانەش لاواز دەبێت کە لەوانەوە فێـر بووە.

کاتێـک دەیانەوێـت ئامۆژگـارییەکی پێشـکەش بـکەن، دوور نیـیە بەرپەرچیان بداتەوە و بڵێت: "خۆ ئێـوە خۆتـان ئەم شـتانە جێبەجـێ نـاکەن، ئیتر بۆچی بە من دەڵێن؟" ئەوەش خۆی لە خۆیدا سەرەتای دابڕانی سۆزە لە نێوانیاندا.

## ٥- ململانێی نێوان چاوەڕوانییەکانی باوان و منداڵ

زۆرێـک لە دایـک و باوکـان بە ئەنـدازەیەک هـۆگری منـداڵەکەیانن، کە تەنـانەت بـوار نـادەن بچـووکترین هەڵەش ئەنجـام بـدەن. ئەمەش زیـاتر لە سەروەختی بڕیارداندا دەردەکەوێت، کاتێک ئەمسەر و ئەوسەری لێ دەگرن و ناهێڵن خۆی بڕیار بدات، سوورن لەسەر ئەوەی منداڵەکەیان ئەوە هەڵبژێرێت کە ئەمـان بەلایـانەوە دروسـتە. ئەمە لە کاتێکـدا بێئاگـان لەوەی دەیانەوێـت ڕۆڵەکەیان بکەن بە ئامرازێـک بـۆ پڕکـردنەوەی پێداویسـتییەکی پڕنەکـراوەی خۆیان. واتە کاتێک دەڵێن: "ڕۆڵە گیـان، ئـێمە بـۆ تۆمـانە." لێـرەدا -زۆربەی جار- ئاواتێکی بەدینەهاتوو یاخود پێداویستییەکی پڕنەکـراوەی بـاوان لەژێـر ئەم دەربڕینەدا خۆی حەشار داوە.

بـا وەهـا دابنێـین کە باوکێـک بە منـداڵەکەی دەڵێـت: "کچـم، پزیشـکی بەناوبـانگترین پیشـەیە. لەپێنـاو ئەوەی تـۆ ببیـت بە پزیشـك، هەر چـیمان لەدەست بێت درێغی ناکەین." لێرەدا پرسیارەکە ئەمەیە: ئایا منـداڵ تـا چەنـد حەز و خولیای بـۆ ئەم پیشـەیە هەیە؟ ئەگەر منـداڵێکی هەستناسـک بێـت، لەوانەیە خولیایەکی زۆری بۆ میوزیک هەبێت، ئەگەر بـواری بـۆ بڕەخسـێت ڕەنگە لەپاڵ میوزیکژەنە جیهانییەکاندا خۆی ببینێتەوە. بۆیە زۆر گرنگە دایک

و بـاوک هەوڵ بـدەن لە تواناکـانی منـداڵەکەیان تێـبگەن و بەگـوێرەی لێهاتنەکانی ئاڕاستەی بکەن.

لە خاڵەکانی دواتردا تیشک دەخەینە سـەر ئەو ململانێیـانەی کە لەنێوان خێزان و منداڵدا سەر هەڵدەدات و دەبێتە هۆی ئەوەی منـداڵ لە خێـزانەکەی دابڕێت، چونکە ئەگەر ئاگاداری ئەم لایەنە نەبـین، گلەیـی و گازنـدەی زۆر دروست دەبێت: "ئاخر من باوکێـک/دایکێکی زۆر بـاش بـووم بـۆی، نـازانم چیی لێ بەسەر هاتووە؟".

## یەکەم: چاوەڕوانییە ناواقعییەکان

کاتێک باوان منداڵەکەیان بەباشی ناناسن و نازانن توانـا و خولیاکـانی لە چ بوارێکدان، دەچن بە ئاڕاسـتەیەکی چەوت هـانی دەدەن. بـا وای دابنێین منداڵێک ترسی لە خـوێن هەیە، کەچـی خێـزانەکەی زۆری لـێ دەکـات بـۆ ئەوەی بچێـت پزیشـکی بخوێنێـت، لەو پێناوەشـدا بەردەوام لەپەنـا گـوێی دەخوێنن، بۆ ئەوەی یەکەمی پۆل بێت.

یـاخود خێزانێکــی تـر هەر ئەوەنــدە دەبینێــت کە منـداڵەکەیان حەز و خولیــای بــۆ یــارییە ئەلکترۆنییەکــان هەیە، زۆری لـــێ دەکەن ببێــت بە ئەنـدازیاری کۆمپیـوتەر، ئەمە لە کاتێکـدا نـازانن ئایـا ئەم منـداڵە خـاوەنی مێشـکێکی ئەدەبـیە یـان زانسـتی. بەپـێچەوانەی چاوەڕوانییەکـانی خێـزانەکەی، ڕەنـگە زیـاتر تـامەزرۆی مێـژوو و بـوارە کۆمەڵایەتییەکـان بێـت. هەنـدێک جاریش باوکەکە خۆی ئەندازیاری بیناکارییە، زۆر لە منداڵەکەی دەکـات بـۆ ئەوەی ئەویش هەمان بەش بخوێنێت، بەڵام کچەکەی بە هیچ جۆرێـک نە لە دوور نە لە نزیک خولیای بۆ نەخشەکێشانی بینا نییە.

دەرئەنجام ئەو منداڵانەی کە زۆریان لێ دەکرێت بۆ ئەوەی بوارەکانی وەک پزیشکی و ئەندازیاری بخوێنن، سەرباری ئەوەی کە حەزیشیان لێی نییە، لەگەڵ خێزانەکانیاندا تووشی ململانێ دەبن. بۆ ئەوەی دەمەقاڵەیش دروست نەبێت، ناچار دەبن دووڕووانە مامەڵە بکەن. ڕەنگە بیرکردنەوەیەکی وەهای بۆ دروست ببێت: "ئەگەر وەک ئەوەش نەبم کە ئەوان دەیانەوێت، با هیچ نەبێت بەو جۆرە خۆم دەربخەم." بەڵام ویژدانی منداڵ -ئەگەر لەگۆڕ نەنرابێت- هیچ کات ئەم دووڕوویییەی پێ قبوڵ ناکرێت. هیچ دووریش نییە کاردانەوەیەکی نالۆژیکانە بنوێنێت، بگاتە تینی و دەست لە دنیا بشوات و بە دەستی بەتاڵ بۆخۆی بسووڕێتەوە، لە حاڵێکدا ئەگەر ئاواتی خێزانەکەشی هێنابێتە دی و بووبێت بە پزیشکیش، ژیانی بە خۆزگە و پەشیمانی دەباتە سەر.

پێم خۆشە لەسەر ئەم خاڵە بوەستین: کاتێك منداڵ دەبینێت کە ناتوانێت بەو ڕادەیە سەرکەوتوو بێت لەو بوارەی کە خێزانەکەی بۆی هەڵبژاردووە، هەوڵ دەدات بەرەو ئەو بوارانە بچێت کە حەز و خولیای بۆیان هەیە. هەروەها ئەگەر لەم ڕێگەیەدا کەسانێک یان گروپێکی جیاواز هاوکاری و پشتگیریی خۆیانی بۆ دووپات بکەنەوە، ئیتر ئەم منداڵەش هەوڵ دەدات بە هاوکاریی ئەو کەسانە ناسنامەیەکی نوێ، بەو جۆرەی کە خۆی ئاواتی بووە دروست بکات. ئیتر دەمەقاڵە و ململانێکەش لەنێوان خێزان و منداڵدا لێرەوە دەست پێ دەکات.

## دووەم: کە منداڵ دەبێت بە قوربانی بەدیهاتنی خەونەکانی باوانی

وەک لە نموونەکەی سەرەوەدا بینیمان، هەندێک جار منداڵ دەبێتە قوربانی خەون و خەیاڵەکانی باوانی. ڕەنگە دایکەکە ویستبێتی ببێت بە

پزیشك بەڵام بواری بۆ نەڕەخسابێت، یاخود باوكەكە كۆلێژی پزیشكیشی خوێندبێت، بەڵام هەلی بۆ نەڕەخسێنرابێت كە بڕوانامەكەی بەدەست بهێنێت. زۆرجار باوان حەز دەكەن ئەو خەون و خەیاڵانەی كە بۆ خۆیان بەدی نەهاتووە، منداڵەكانیان بەدی بهێنن.

لەم ڕووەوە پێویستە باوان سەرلەنوێ پێداچوونەوە بۆ داخوازییەكانیان بكەن؛ ئایا ئەم چاوەڕوانییانەی كە من لە كچەكەم هەمە، پڕكردنەوەی پێداویستییەكی تەواونەكراوی خۆمە یان نا؟ چونكە منداڵان ئەو كاتە دڵخۆش دەبن كە خەونی خۆیان بەدی بهێنن، نەك ببن بە ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی خەونی باوانیان.

لەلایەكی ترەوە، دایك و باوكان دەبێت ئەوە لەیاد نەكەن كە هەموو منداڵێك تاكێكی جیاوازە. هەر یەكەیان خاوەنی جیهانێكی تایبەت بە خۆی و حەز و خولیای جودایە، بۆیە مەرج نییە هەمان ئاوات و خەیاڵی باوانی هەبێت، ڕەنگە ئەوەی ئەوان ئاواتیان بووە بۆ ئەم كابوس بێت. كەواتە باشتر وایە باوان زۆر لە منداڵەكانیان نەكەن و بەزۆر بە ئاڕاستەیەكی دیاریكراودا نەیاندەنە بەر.

## سێهەم: كاتێك باوان ڕای منداڵەكانیان وەرناگرن

ئەگەر بێتوو هەر لەسەر نموونەكەی سەرەوە بەردەوام بین، با بڵێین خێزانێك حەز دەكات منداڵەكەی ببێت بە دكتۆر، دەبینن منداڵەكەشیان بە هەمان ئاڕاستە هەنگاو دەنێت و سەری دەخورێت لە بابەتی پزیشكی و ئەو گۆڤارانەی كە تایبەتن بەو بوارەوە. باوانیش كە ئەم نیشانانە دەبینن، بڕیاری ئەوە دەدەن منداڵەكەیان بنێرنە كۆلێژی پزیشكی. ئەم ڕەفتارە با تا ڕادەیەكیش دروستیش بێت، بەڵام ئەوە ڕاستییەكە و بەشێكە لە سروشتی مرۆڤ، ب

ئارەزوویەکی زۆریشی بۆ شتێک هەبێت، پێی خۆش نابێت بەبێ وەرگرتنی ڕای خۆی بڕیار لەسەر چارەنووسی بدرێت. ئەو منداڵانەی سەبارەت بە داهاتوو و بڕیارەکانیان ڕای خۆیان وەرناگیرێت، با ئەو بڕیارەش پەسەند بکەن، بەڵام دەبێتە هۆکاری دروستبوونی کاردانەوەیەک کە منداڵ خۆیشی نازانێت هی چییە. چونکە ڕەنگە هەستێکی وەهای لا دروست بکرێت، کە ئەو بەشێکە لە جێبەجێکەری بڕیارەکانی کەسانی دیکە. ئەمەش سروشتی ئادەمیزادمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە کاردانەوەی بۆ ئەو شتانە هەیە کە بەبێ گوێپێدان و وەرگرتنی ڕای خۆی بڕیاری بۆ دەدرێت.

### ٦- پێویستە باوان پێگەی دایکایەتی و باوکایەتی خۆیان لەدەست نەدەن

زۆر جار دایک و باوکان پێگەی خۆیان لەلای منداڵەکانیان لەدەست دەدەن و هەستیشی پێ ناکەن. هەندێک هەڵسوکەوت هەن کە هەرگیز لە کەسی پێگەیشتوو ناوەشێتەوە، بۆیە کاتێک منداڵ ئەو هەڵسوکەوتانە لە گەورەکانی دەبینێت، نرخ و بەهایان لەبەر چاوی کەم دەبێتەوە و بە چاوێکی ترەوە تەماشایان دەکات.بۆ نموونە؛ ئەو باوکەی درۆ دەکات، یان لەبەر چاوی منداڵەکانی سووکایەتی بە هاوسەرەکەی دەکات و گاڵتە بە میوانەکانی دەکات لەپاش ڕۆشتنیان، گومانی تێدا نییە باوکێکی لەو شێوەیە نرخ و بەهای لەلای منداڵەکەی دادەبەزێت. سروشتی منداڵ، کاری نەشیاو و هەڵسوکەوتی نابەجێی پێ هەرس ناکرێت، بەتایبەتیش ئەگەر ئەم ڕەفتارە ناپەسەندانە لە باوانیدا بەدی بکات کە وێنایەکی پیرۆزیان لە زیهنی ئەمدا نەخشاندووە.

زۆرێک لە باوان بە شانازییەوە دەڵێن لەگەڵ منداڵەکەمدا هەر وەک هاوڕێم. کە بەداخەوە بوون بە هاوڕێی منداڵ، مانای لەدەستدانی پێگەی

دایک و باوکایەتییە. چونکە منداڵ پێویستی بەوە نییە باوانی ببنە هاوڕێی، بەڵکو پێویستی بە باوکێکی خاوەن ئیرادە و بەهێز و دایکێکی هەستناسک و میهرەبانە. بۆیە باشتر وایە دایک و باوکان بەوریاییەوە ڕەفتار بکەن، تاکو نرخ و بەهایان لە چاوی منداڵەکانیاندا کەم نەبێتەوە. وەک دەزانن ئەم مەسەلەیە تەنیا ڕووی لە شکۆ و کەسێتیی دایک و باوک نییە، بەڵکو دیوێکی تری ئەوەیە کە بە کەمبوونەوەی متمانە و سەرسامیی منداڵ بە باوانی، کاریگەربوونی بە بەها و ڕەوشتە باڵاکانیش کەم دەبێتەوە.

## ٧- بەرکەوتنی منداڵ لەگەڵ ئەو شتانەی کە لە تەمەنەکەی گەورەترن

یەکێک لەو هۆکارانەی کە وا دەکات منداڵ لە خێزان دابېڕێت، ڕووبەڕووبوونەوەیەتی لەگەڵ کۆمەڵە ڕووداوێکدا کە هاوشانی تەمەنەکەی نین. ئەمە دەکرێت ڕووداوێکی وەک لاقەکردن یان جیابوونەوەی دایک و باوک بێت. لە ئەگەری ڕوودانی هەر کام لەم حاڵەتانەدا، پێویستە باوان پشتگیریی تەواوەتی خۆیان بۆ منداڵەکانیان دەرببڕن، دەنا زەمینە دەڕەخسێت بۆ سەرهەڵدانی چەندین شڵەژان و تێکچوونی ڕەفتاری. کاتێک منداڵ کەسێکی خۆشەویستی خێزانەکەی لەدەست دەدات، وەک حاڵەتێکی ئاسایی هەر منداڵە و بەگوێرەی سروشتی خۆی کاردانەوەیەکی جیاواز دەنوێنێت. بۆی هەیە ڕەفتاری شەڕانگێزانەی لێ بەدەر بکەوێت، یان بە هۆی ئەوەی کە تەقەبولی مردنەکەی نەکردووە، لەوانەیە زۆر بترسێت. خۆ ئەگەر باوان لەم حاڵەتەدا زەخیرەی خۆیان نەخەن لە ڕووی مەعریفی و سۆزدارییەوە و هەوڵی هێورکردنەوەی منداڵەکەیان نەدەن، لەو حاڵەدا

ئەویش بۆ هێورکردنەوەی خۆی پەنا دەباتە بەر چەنـدین ڕێگـای جیـاواز، کە ئەمەش بۆی هەیە بەناخۆشی بشکێتەوە بەسەر منداڵ و باوانیشدا.

واتە کاتێک هەست بەوە دەکات کە خێزانەکەی هاوکـاریی نـاکەن بـۆ ئەو بارە دەروونییە قورسەی کە لەسەر شـانیەتی، ئیتر وردە وردە لە بـاوانی دوور دەکەوێتەوە.

## ٨- ئەگەر دەمە قاڵەی نێـوان بـاوان و منـداڵ لە کـاتی خۆیـدا چارەسەر نەکرێت

نوانـدنی ڕەفتـاری نەشـیاو و نائاسـایی لە منداڵـدا، بەزۆری لە قۆنـاغی هەرزەکاریدا بەدی دەکرێت. ئەگەر لەم قۆنـاغەدا کە گۆڕانکـاریی هـزری و جەستەیی و سۆزداری بەسەر منداڵـدا دێـت، خێـزانەکەی پشـتگیری نەکەن، ئەوا نائاسـاییبوونی حـاڵەتەکە تەشـەنە دەکـات. بە دەربڕینێکـی تـر، ئەگەر گرفتەکانی قۆناغی هەرزەکـاری دەمودەسـت چارەسـەری بـۆ نەدۆزرێـتەوە، دەبێـتە هـۆی ئەوەی منـداڵەکە لەسـەر ئەو ڕەفتـارانە بەردەوام بێـت و لە خێزانەکەشـی دابـڕێـت. ئەم بـابەتە لە بەر ئەوەی لە بەشـەکانی پێشـوودا لەسەری وەستاوین، لێرەدا هەر ئەوەندە ئاماژەی پێ دەدەین.

## ٩- پەیوەندیی ناتەندروست لە خێزاندا

لەم بەشـەدا، هەوڵـمان دا تیشـک بخەیـنە سـەر ئەو هۆکـارانەی کە کاریگەرییان هەیە لەسەر هەڵسوکەوتی نائاسـایی منـداڵان لەنـاو خێزانـدا. گـرنگترین خـاڵی تـایبەت بەم مەسـەلەیە، بـریتییە لە بـوونی پەیوەنـدییەکی تەندروست لەگەڵ منداڵدا. کە باس لە پەیوەندی دەکەین، تەنهـا مەبەسـتمان لە پەیوەندیی زارەکی نییە، بەڵکو زیاتر مەبەستمان لەو زمـانە نـازارەکییەیە کە

سەرچاوەی گەیاندنی چەندین پەیامی کاریگەرە بە ئەقڵی ئاگا و نائاگای منداڵ و لە بنچینەدا لە زمانی زارەکی کاریگەرترە.

ئەگەر لە خێزانێکدا گرفتی پەیوەندی هەبێت، زەحمەتە منداڵ لە رووی سۆزدارییەوە بتوانێت پێداویستییەکانی بە شێوەیەکی تەندروست پڕ بکاتەوە. تێکچوون و شپرزەیی رەفتاریش دیارترین دەرهاویشتەی ئەم حاڵەتەیە. کەواتە دەتوانین بڵێین گرنگترین شت لە خێزاندا، بوونی پەیوەندییەکی پتەو و تەندروستە.

# پێڕست

# هونەری دایکایەتی

لەم پەرتووکەدا، لەپاڵ باسکردنی ئاسانیی ئەرکی دایکایەتی و باوکایەتی، ڕۆشنایی دەخرێتە سەر ئەو وردەکارییە ورد و گرنگانەی کە زۆر جار لەناو خێزاندا فەرامۆش دەکرێن. هاوکات ڕێگەچارەی گونجاو بۆ گرفتە باوەکان پێشنیار دەکرێت، کە زۆرێکمان بەدەستیەوە گیرۆدەین.

تەوەرە سەرەکییەکانی ئەم بەرهەمە:

- ڕێگرییەکانی بەردەم دایکایەتی چین؟
- ئایا لە پەروەردەی منداڵدا، نیازی باش و خۆشەویستی بەسە؟
- پرۆسەی ناسینی منداڵ لە لایەن دایکیەوە چۆنە؟
- ئایا شوێنەواری منداڵیی بەسەر گەورەکانەوە دەمێنێتەوە؟
- جیاوازیی نێوان دایکی خۆپەرست و دایکی خودسەنتەر چییە؟
- ململانێی نێوان دایک و منداڵ: جەنگی شکۆمەندی!
- تەنها دایکایەتییەکی سروشتی بکە!
- پێداویستییەکانی منداڵ، دەبێت لە کاتی خۆیدا پڕ بکرێنەوە
- ئەو یاسا و ڕێسایانەی لەگەڵ ڕۆحی منداڵدا یەك ناگرنەوە کامانەن؟
- چۆن منداڵ فێری یاسا و ڕێکخستن بکەین؟
- پەروەردە بە (کردار) لەپێش پەروەردەوەیە بە (گوفتار)!
- شپرزیی لە ڕۆڵی ئەندامانی خێزاندا، چ گرفتێک دروست دەکات؟
- لەبەر چی دایکان ناتوانن باوکایەتی بکەن؟
- چی وا دەکات بەهاکانی خێزان لە منداڵدا ڕەنگ نەداتەوە؟